چاپی نوێ

سەدان وشەی پێویست

سەدان رستەی ئامادە

دەیان لاپەڕەی نوێ



کورتەیەک دەربارەی

# شێوازی ئاخاوتنی عێراقیانە

نووسینی
ئەبوبەکر کاروانی

چاپی سێیەم

کورتەیەک دەربارەی :

# شێوازی
# ئاخاوتنی عێراقیانە

نووسینی

ئەبوبەکر کاروانی

**پێناسەی کتێب :**

ناوی کتێب: کورتەیەك دەربارەی شێوازی ئاخاوتنی عێراقیانە

ناوی نوسەر: ئەبوبکر رەشید موحەممەد ( کاروانی )

تایپی کۆمپیوتەری: دەریا محمد

نەخشەسازی کۆمپیتەری: چاپەمەنی چوار چرا

جیاکردنەوەی رەنگەکانی بەرگ: سامان موحەممەد ساڵح

تابلۆی پێشەوەی بەرگ: هونەرمەند ( محەممەد فەتاح )

وێنەی دواوەی بەرگ: بەغداد

چاپی بەرگ: چاپەمەنی هیلێن

راکێشان و زۆر کردن: چاپەمەنی چوارچرا

ساڵی چاپ ٢٠٠٦ مانگی ( ٧ )

نۆبەتی چاپ: سێهەم

ژمارەی سپاردن: ( ٣٥٣ ) ی ساڵی ( ٢٠٠٤ ) ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە .

تیراژ: ٢٥٠٠ دانە

نرخی ( ٤٠٠٠ )چوارهەزار دینارە

# پێشەکی چاپی سێهەم

سەرەتا سوپاس بۆ خوای مەزن کە توانای ئەوەی پێ بەخشیمەوە زیاتر لە (٦٠) لاپەڕە بۆ ئەم نوسراوەی بەردەمتان زیاتر بکەم و زانیاریەکی زیاتر بەخوێنەرانی ئازیز بگەیەنمەوە"هەروەها زۆر بەکورتی و خێرایش سوپاسێکی زۆرم بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی لە لەچاپدانەوەی ئەم چاپە نوێیەدا یارمەتی و هاوکاریان کردم " لەوانە ئەو بەڕێزو ئازیزەی کە نەیخواست ناوی بهێنم و جۆری یارمەتیەکەشی بەشاراوەیی مایەوە. هەروەها سوپاسم بۆ مامۆستا عومەر کەئەرکی لەچاپدانەوەی گرتە ئەستۆ. هەروەها سوپاسی زۆری برایان لەچاپەمەنی چوارچرا و هەموو ئەوانەش دەکەم کە لە راکێشانەوەیدا هاوکارم بوون .

ئەوە ماوەتەوە کە بڵێم ئەو بەڕێزانەی دەیانەوێت بابەتی خوازراو و پێویستی خۆیان لەچاپەکانی داهاتوی ئەم بەرهەمەدا بێت، تکایە با لەرێی ئەم ئیمێڵەوە پەیوەندی بکەن :

Karwani٥٩@yahoo.com .

(وەیاخود)

Abo_baker_karwani@yahoo.com

## ﴿ بەناوی خوای گەورەو میهرەبان ﴾

## بـــــەربـــــاس

ئەم جارە، بابەتێك دەخەمە بەر تیشك كە هەرچەندە وا دێتـە بەرچـــاو (هەنوكـــەیی) و خـــوازی ســـەردەم بێـــت، بـــەڵام تایبەتمەندیـەكی هەیـە كـە وا دەكـات بـەردەوام و لـە هـەموو ســـەردەم و كاتێكـــدا، وەك بابـــەتێكی (نزیـــك) و (هاوســـێ)ی خۆمان سەیر بكرێت و خامە نەخشینی تێدا بكرێت.

لـە لایـەكی تریـشەوە (دەگمـەن بـوون)ی ئـەو باسـە لـەو ڕووەوەی كە هێشتا خامە ڕێژی تێدا نەكراوەو نۆتە هۆیـەك بۆ ئەوەی سەرچاوە لەو بارەیەوە دەگمەن و لە حـوكمی نـەبـوودا بێـت.

هۆی نزیكـــی و هاوســـێ بـــوون، وەهمێكـــی مـــەعریفی و تراویلكەیـەكی لـەناو ئـەم دەڤـەرەدا خولْقانـدووە كـە ئـەویش (وازانین)ی ئەوەی كە چیتر ئەو بابەتـە (زانـراوە) و پێویست بە نووسینەوەی ناكات!

بــەڵام، ئــەدەبی نووســـراو جــۆرێكی زۆر شارســـتانیانەی مێــژووی دوێنــێ و ئـەمڕۆو سبەی هـەر نەتـەوەو میللەتێكـە كـە ناكرێت لە توێی وەهمەكانـدا قاڵـب بەنـدی و زینـدانی بكرێـت. وە بگرە بە ڕادەیەك گرنگ و پڕ بایەخە كە (كەلتوری زیندوو

مەعریفی) هەر شارستانیەتێك و حاڵەت و دۆخی مەعریفی سەردەم و شوێنێکی لە ڕووەوە پێ دیاری دەکرێت و پێکیشی دەهێنێت. سەرەڕای ئەوەش، بە ئەرشەفەو دیکۆمێنت کردنی ئەو کەلتورو مەعریفەش کە سەرئەنجام حاڵەتی فەرهەنگی و ڕۆشنبیریان پێك دەهێنێت، کۆتایی دێت. وە هەموو (سەرەتا)کانی ئەو سەردەمەش کە هێشتا نەهاتووە، دەخوڵقێنێت و ئەفراندنەکانی داهاتوشیان لە ناخیدا حەشار دەدرێت!.

ئەم تێگەیشتنەش، کۆك نیە لەگەڵ ئەو دەهاویشتە ڕیفلێکسی و ئەنتی ڕیفلێکسیانەی کە بە پەچەکرداری سەردەم و شوێن و تێگەیشتنەکانی دەزانرێن و هیچ ڕۆڵێك لە (جوڵە)ی ڕۆشنبیریدا نابینن. ئەم تێگەیشتنە، لەسەر ئەو بنەما مەدەنی و ئاخاوتن و مەعریفیەیە دامەزراوە کە (جیاوازی) سەردەمێك وەیاخود چاخێك لەوەدا دەبینێتەوە کە (تا چەند؟) ئامرازەکانی دەربڕین و ئاخاوتن و پەیوەندی دان، بەرەو گەشەسەندن و نماکردن ڕۆیشتون و حاڵەت و دۆخی مەعریفی نوێیان بە خۆوە بینیوە.

لێرەوەیە (نووسین)و ئەدەبەکەی، خۆی لە بالاترین چەشنی مەعریفی دا دەدۆزێتەوەو شوێن و پێگەی شیاویش لە بۆ خۆی دەستەبەر دەکات. بەم پێیە ئەو تێگەیشتنە، دەگات بەوەی کە

هـەموو بەرهـەمی شارسـتانیەت لـەوەدا دەدۆزێتـەوە کـە (نووسـراوی بـوون)، هۆیـەکی هـەرە مـەزن لـە بـۆ بـە دامـەزراوەکردنی زانـستەکان و پەیـدا بـوونی حاڵـەتی ووردبوونەوەی زانستەکان بهێنێتە ئاراوە.گومـان لـەوەشدا نیە کـە(یەکانگیر بوونـەوە)وە (جویّ بوونـەوە) کانیش لـە زانستدا، لـە بەرهەمـەکانی (ئـەدەبی نوسـراو)وەوەو لـەڕێی نووسینەوە هاتونەتـە کایـەوەو حاڵەتـەکانی ئەفرانـدنیش، سەرپەرشـتی دەکات.

لێرەویـە نزیکـی و هاوسـێ بـوونی عـەرەب – بـە تایبـەتی عێراقی – لە کوردستان و میللەتی کوردەوە، ئەوە ناگەیـەنێت و بیانوش نابێت بۆ ئەوەی کە ئەرکی زانستی و نەتـەوەیمان لـەبیر بکـەین و ئـەو چـەند خاڵـە بکەینـە بیـانوی ئـەوەی کـە خامەنەخشینی لەو بارەیەوە نەکرێت.

بەم پێیە، ئەرکی بەندە هەرچەندە بە ڕواڵەت ئاسان و سوک دێتـە بەرچـاو، بـەڵام قورسـاییەکی ئێجگـار گـەورەو مـەزنی خستۆتە سەرشانی بەندەو ئەوانی دیکەش بۆ ئەوی سەرەتایەك بـۆ ئـەو (زاراوە) یـەو شێوازی ئاخاوتنیـان بسازێنین. ئەمـەش هەرچەندە ڕۆڵی (فێرکردن) و بارهێنانی زێتر پێوە دیارە، بـەڵام دەکرێـت خاڵێـك لـە خاڵـەکانی (توێژینـەوە) لـەو بارەیـەوە بهێنێتەوە ئاراوەو کەڵکی زانستی خۆی بۆ ئەو بوارەش هەبێت.

بە هـیوام ئـەم بەرهەمە،نەتەنیا سەرەتایەك بۆ نوسینی لەجۆرە

بێت،بەڵكو هەنگاوێك بۆ نوسینی چاكترو بەربڵاوترو بە پێزتر بێت و درگایەكی نوێ لە بواری ڕۆشنبیری كوردیدا بخاتە سەرپشت. گومان لەوەشدا ناكەم كە هەڵە لە تاووتوێی نوسینەكەدا هەیە، بە هیوام بە چاوی زانستیەوە لێی بڕوانن و سوپاسی هەموو ئەوانەش دەكەم كە لە دایك بوونی ئەم بەرهەمەدا یارمەتیان دام. بە تایبەت مامۆستا (ڕۆوف حەسەن) كە ئامۆژگاریەكانی رونكەرەوەی شێوازی نوسینی ئەم كتێبە بوو.

سوپاس بۆ چاپەمەنی (بابان)و كاكە دەرون و دەریاو ئالان و...

سوپاس بۆ خێزانەكەم مامۆستا شەهلا كە بەردەوام مۆڵەت و بیانوی كاركردنم بۆ دەردۆزێتەوەو هەلم بۆ دەرەخسێنێت.

٢٠٠٤/٧

ومن الله التوفيق

ئەبو بەكر كاروانی

# تعريف بالكتاب

**كيفية الاستفادة من الكتاب من قيبل الأخوة العرب :**

**ان اسلوب كتابة هذا الكتاب، يصلح ان يكون كتاباً يقرأ باللغة الكردية، وذلك لان الهدف منه، تعليم الأخوة الكرد بكيفية المحادثة باللهجة العراقية وهم المعنيون بذالك. ولكن لايخفى على القارىء الذي يهتم بقرأءة مابين السطور من المعانى، ان بأمكان الاستفاده من الكتاب حتى لولم يكن موضوعة امامه ومستهدف غيره من القراء، لذا نذكر القارىء بملاحظات قد يساعده في الاستفادة من الموضوع :**

**١/ بأمكان الاخوة العرب ملاحظة الفروق بين الكلمات العربية والكردية ومعرفة الأختلافات التى بينهما والتى منها :**

**أ / ان في اللغة الكردية احرف لاتجد مثيلاتها ( كتابتةً) في اللغة العربية، مثل ( چ، ڕ ، ژ، ۆ ، ێ ، یـ ، گ ، ڵ ) ولكن يجد القارى تلك الحروف ملفوظة فى اللهجة العراقية :**

گ : گتلك

چ : چان

ۆ : لۆ

**ب / بما ان الهدف من الكتاب هو تعليم الاخوة الكرد واتقانهم بعض جوانب تلك اللهجة، لذا نرى ومن خلال قراءة النصوص، ان بعض الكلمات قد تهجئت حسب الهجاء في اللغة الكردية وذلك لتسهل تعلم القارىء الكردي :**

**بێش ؟ ( الاصل ) بيش ؟ ( بكم ؟ )**

ج / يمكن للاخوة العرب تعلم كيفية قراءة الكلمات الكردية من خلال الملاحظات الاتية و الملاحظات السابقة :

الضمة : تكتب ( و ) واوا بعدالكلمة .ولكن في اللغة العربية توضع على الحرف المقصود تحريكها .

| | |
|---|---|
| گُلی | گوللی |
| صُبُغ | سوبوخ |
| غُرفه | غورفه |

الفتحة : تُكتب الفتحة ( كهاءمتصلة ) بالحرف المقصود تحريكها :

| | |
|---|---|
| جَمل | جهمهل |
| كَتَب | كهتهبه |

الكسرة : تكتب الكسرة ( ياءَ ) متصلاً :

| | |
|---|---|
| حِب | حيب |
| حِساب | حيساب |

الشدة : تُكرر الكلمة المراد تشديدها او تُضاف ( ) فوق الكلمة او تحتها:

| | |
|---|---|
| دُرّه | دووڕه |
| الحجّه | ئهلحوججه |

من هنا يلاحظ القارى بان ( ێ ، یـێ ، ڕ ، ۆ ، ڵ ) كلها نفس الكلمات العربية مع تثقيلها او تشديدها .

د / يلاحظ القارىء العربي وبالعكس القارىء الكردي، بان بعض الاحرف قد خُففت في اللغة الكردية وقد استُبدِلت بعض باحرُف اُخرى :

| | |
|---|---|
| ص | س |
| ض | ز |
| ذ | ز |
| ط | تاء |
| ظ | زاء |

وهنالك طريقه سهلة لكلمة يعرف القارى العربي او الكردى بها التغيرات في الاحرف والكلمات وحتى في كيفية تكوين جملة وكيفية كتابته ولفظ الاحرف والكلمات. وذلك ( بالتَمعُن ) و ( مُشاهدة ) ما يرادفها في اللغة المراد تعليمها:

| | |
|---|---|
| گتلك | گتلەك |
| دُرَه | دوڕڕ |

## چەند خاڵێکی گشتی

سەرەتا پێویست دەکات چەند خاڵێك وەك زانیاری گشتی سەبارەت بە زاراوەو شێوازی دەبڕینی عێراقیانە بوترێت، ئەویش:-

١- مەبەست زیاتر لەو زاراوەیە کە هەموان دەتوانن لە ڕێیەوە بدوێن. وە هەرچەندە زاراوەو شێوازی دەبڕینی ژوروو وە خواروی ولات لە ئاخاوتندا لە ئارادایە، بەلام هەوڵی ئەوە دراوە کە زێتر زاراوەی بەکارهێنراو لە (ناوەڕاست)ی ولاتدا بەکارببرێت.

لێرەدا پێویست دەکات ئەوە بووترێت کە بەهۆی تێکەلاوبوون و هاتوچۆو کەم بوونەوەی ڕێگرەکانی بە تایبەتی لەبەردەم هاولاتیانی خوارووی ولاتدا، کەم تا زۆر تێکەلاویەکیشی لە زاراوەکاندا هێناوەتە ئاراوە. لێرەوەیە لەم نوسینەشدا تێکەلاوییەك بەدی دەکرێت هەرچۆنێك بێت، ئەو تێکەلاویە، شێرەیەکی بەربلاو لە شێوازی ئاخاوتندا لەم دەڤەرەدا پێك دەهێنێت.

٢- خاڵێکی گرنگی (بوونی جیاوازی) لە نێوان زاراوەکانی عێراقدا، سەرەڕای جیاوازی کەلتوری و فەرهەنگی و مرۆڤیانەی تر، بە بوونی چەند جیاوازیەك لە (دەربڕین)ی هەندێك پیت

وەك (ق) ،(شـێوازیش) ڕۆڵێكـی تـر لـە بـوونی جیاوازیـدا دەبینێت.

٣- گومـان لـەوەدا نیـە كـە تـا (دەربـڕ)ی قـسە ژیرتـر بـێ، دەربڕین و شێوازی ڕستەسازیشی جوانترو بەرزتر دەبێت.

٤- زۆرجـار دەكرێـت لـە ڕێی هەنـدێك ووشـەوە، (شـوێن)ی بێژەرەكەی دیاری بكرێت.

* ئەوانـەی (بەغـدا)و دەوروبـەری بـن، زێـتر لـە كـاتی قـسە كردندا ووشەی (لعد) وەك پێشگرێك لەگەڵ زۆر لە ووشەكانی و لە كاتی ڕستەسازیدا بەكار دەبەن:

- لعد وین تروح؟
- لعد شأسوی؟

* ئەوانەی خەڵكی ژووری وڵات بن بە تایبەت (موصل)و دەوروبەرەكەی، ئەوا زۆربەی ئەو ووشانەی كە لە كاتی دەربڕیندا لە خواروو وە ناوەڕاستی وڵاتدا بە (گ) دەردەبڕێن. ئەوا لەلای ئەمان بە (ق) دەگۆڕێن:

- گولی قلی

* ئەوانـەی خـەڵكی خـواروی وڵات بـن بـە تایبـەت (عمـارە)و دەوروبەرەكەی، ئەوا ووشەی (چا) وەك پیشگرێك لەگەڵ زۆر لە ووشەكانی تر داو لەكاتی ڕستەسازیدا بەكار دەبەن:

- چا شلون تروح؟

٥- خـاڵیكی هـەرە گرنگـی تـریش ئەوەیـە كـە (جـۆری كەسایەتی)و (شێوازی تێ ڕامان). خالیكی هاوبەشە لە نێوان هـەموو مرۆڤایـەتی و بگـرە هـەموو زاراوەو شـێوازەكانی تـردا

بــوونی هەیــە. بــە واتایــەکی تــر. شــێوازی بیرکردنــەوەو کارتێکەریەکان و چۆنیەتی وەرگرتن و ئەمبارکردن و دانەوەی زانیاری، هۆکارێکی هەرە گرنگە کەوا دەکات (خاڵی هاوبەش)ی زۆر لەلایەك لەنێو مرۆڤەکان و لەلایەکی تریشەوە لە نێوان (زاراوە) و (زمان)ەکاندا هەبێت و ئاسانکاریك لە وەرگرتن و تێگەیشتن و پەیوەندسازیدا دروست بکات.

بە گشتی دەکرێت پردێك لە پەیوەندسازی و لێك گەیشتن و پەیوەنددەر هەبێت، لەنێو زاراوە جیاوازەکان و بگرە لە نێو زاراوەو زمانە سەرەکیەکەی ئەو وڵاتەو بگرە لە نێو زاراوەو زمانە جیاوەکانی جیهاندا کە بە کەمێك وردبونەوەو تێگەیشتنەوە، دەدۆزرێتەوە کەڵکی خۆی بۆ کەس و بێژەرەکەی دەبێت. لەوانە:

١ - بەوەی مرۆڤ چەند خەسڵەتێکی دەرونی بەڵگە نەویستی تێدایە کە بە سەرجەم کردنیان (وە یاخود) بە بەکارهێنانی لاوەکیانەوە لارکراوانەی هەر بەڵگە نەویستێکیان، دەکرێت (لێکچون) و (هاوتابوون)ێك بێنێتە ئاراوە کە چیتر لە سنوری زمانەوانیدا نامێنێتەوەو پێکهاتە مرۆڤیەکان و (جۆرەکان) و (چەشنی ئایدۆلۆژیا)کەیان زێتر دەردەخات. نمونەی ئەوەش، مرۆڤ بیەوێت و نەیەوێت جۆرێك لە (بوون) و کەینونەتی خۆی هەیە کە زۆرجار لەلای چەشنێك لە مرۆڤ لە بەکارهێنانی ووشەی (من)دا دەردەکەوێت و زۆربەی جاریش (لە پێشەوە)ی ڕستەکانیدا دەردەکەوێت:

- آني اگولك روح.   من پێت دەڵێم بڕۆ.
- آني اگول .......   من ئەڵێم.......
- آني اريد .......   من ئەمەوێ.......
- آني اشوف .......من ئەبینم.......

جاری وەها هەیە بەوەی چەشنێکی دیکە لە مرۆڤ خۆی بە بەشێکی دانەبڕاو لە کۆمەڵ دەزانێت و زێتر گرنگی دەدات بە لایەنی کۆمەلایەتی بوونی خۆی، لەوێوەیە کە زێتر وشەی (ئێمە) بەکار دەبات.

جاری واش هەیە کاتێک ئەو وشەیە بەکار دەبات، ئەوا چەشنێك لە فەرهەنگ و ڕۆشنبیری دەردەخات و خۆ بەلایەنداریشی دەزانێت.

| | |
|---|---|
| - احنه مو هیچی. | ئێمە وەها نین. |
| - احنه ما نسوی هیچی | ئێمە وەها ناکەین. |
| - هسه شنسوی؟ | (باشە) ئێستا چی بکەین؟ |
| - لا، ما نريد. | نەء، نامانەوێت. |

# دوێنێ ، ئەمرۆ ، بەیانی

*بەوەی مرۆڤ بە شێوەیەکی ناخود ئاگاو ئاگایانە، زۆرجار (پێش) بە (ئێستا) و (داهاتوو) شەوە دەبەستێتەوە، و جۆرێک لە زنجیرەبوونی (گوتارو ڕەفتار) لەڕێی قسەوە دەردەخات. بۆیە پێویست دەکات ڕابوردو بە تایبەت (نزیك) بە ئێستاوەو پاشانیش بە (داهاتوو) بە تایبەت (نزیك) ەوە ببەستێتەوە. ئەم بەڵگە نەویستە مرۆڤیانە کە ڕەنگە شێوەیەك لە (پەیوەست بوون) بە (کات) یان (شوێن) یان (کەس) وەیاخود بە (هۆو هۆکار) ەوە بێت، بەردەوام و لە زۆربەی ئاخاوتنەکاندا خۆی دەردەخات و بەسەر مرۆڤدا دادەسەپێنێت. لێرەوەیە پێویستەیەکی زۆر بەوە هەیە کە بەوردی ئەم سێ حاڵەتە بزانرێت:*

| | |
|---|---|
| ألبارحه | دوێنێ |
| أليوم | ئەمڕۆ |
| باچر | بەیانی |
| أولت البارحه | پێرێ |
| قبل أولت البارحه | بەسەر پێرێ |
| قبل اسبوع | پێش (بەرلە) هەفتەیەك |
| قبل شهر | پێش مانگێك |

| | |
|---|---|
| قبل چم شهر | پێش چەند مانگێك |
| قبل سنه | پێش ساڵێك |
| قبل عشرين سنه | بیست ساڵ لەمەوبەر |
| بارحه آلصُبح | دوێنێ بەیانی |
| بارحه آلظُهر | دوێنێ نیوەڕۆ |
| بارحه آلعصر | دوێنێ عەسر |
| بارحه بآلليل | دوێنێ شەو |
| اليوم صبح | ئەمڕۆ بەیانی |
| اليوم بالليل | ئەمڕۆ شەوەکەی (ئەمشەو) |
| باچر صُبح | بەیانی بەیانیەکەی |
| باچر آلعصر (بەیانی) | سبەینێ عەسر |
| باچر بالليل | سبەی شەو |
| عُگبُ باچر | دوو بەیانی |
| عُگب باچر ظهر | دوو بەیانی ، نیوەڕۆ |
| عگُب عُگب باچر | سێ بەیانی |
| بَعد أسبوع | هەفتەیەکی تر (دوای) |
| بَعد شهر | مانگێکی تر |
| بعد خَمستَعش سنه | دوای پانزە ساڵ |
| بارحه جيتك ، ماكو؟ | دوێنێ هاتم بۆلات ، نەبووی؟ |
| اليوم جيَّت. | ئەمڕۆ هاتم (هاتمەوە). |
| باچر أسافر. | بەیانی سەفەر ئەکەم. |

# رۆژ – مانگ –ساڵ

## نـــاوی رۆژەکان

| | |
|---|---|
| سبت | شەممە |
| أحدْ | یەك شەممە |
| إثنین | دوو شەممە |
| ثلاثاء | سێ شەممە |
| أربعاء | چوار شەممە |
| خمیس | پێنج شەممە |
| آلیوم جمعە. | ئەمڕۆ هەینیە. |
| آلیوم ثلاثاء؟ | ئەمڕۆ سێ شەممەیە؟ |
| لا، آلیوم أربعاء. | نا، ئەمڕۆ چوار شەممەیە. |
| الخمیس عندك مجال؟ | پێنج شەممە مەجالت هەیە؟ |

# ناوی مانگەکان

| | |
|---|---|
| كانون الثاني | کانونی دووەم |
| شباط | شوبات |
| آذار | ئازار |
| نيسان | نیسان |
| مايس | مایس |
| حزيران | حوزیران |
| تموز | تەموز |
| آب | ئاب |
| أيلول | ئەیلول |
| تشرين الأول | تشرینی یەکەم |
| تشرين الثاني | تشرینی دووەم |
| كانون الأول | کانونی یەکەم |

| | |
|---|---|
| احنه هسه بيا شهر؟ | ئێمه ئێستا له چ مانگێکداین؟. |
| احنه بتموز | له تهموزداین. |
| يا شهر هسه؟ | ئێستا چ مانگێکه؟ |
| شهر | مانگی... |

ت/١/ دهکرێت (به ژماره)ش مانگهکان بووترێن:

| | |
|---|---|
| شهر الأول. | مانگی یهکهم. |
| شهر آلرابع | مانگی چوارهم |

ت/٢/ بهوهی عێراق ولاتێکی ئیسلامیه، بهکارهێنانی ناوی مانگه ئیسلامیهکانیشی تێدا بهربلاوه.

ت/٣/ لهو کاتانهدا که ناوی مانگ (وه یان) ژمارهکهی مهبهست نیه، پرسیار زۆرجار لهڕێی مانگهوه له ڕۆژ دهکرێت:

| | |
|---|---|
| آليوم ژگد بآلشهر؟ | ئهمڕۆ چهندی مانگه؟. |
| ثنعش بالشهر. | دوانزهی مانگه. |

## ســـــاڵ

بۆ زانینی (ساڵ)، ئهوا له ژمارهو ژماردندا زۆر به ڕوونی، ڕون کراوهتهوه. بهڵام ئهوهنده ئهبێت بزانرێت که (ههزار) له پێش (سهدان)هوه و (سهدان)یش له پێش (دهیان)هوه دهژمێردرێت:

١٩٩٩ ألف و تسعميه و تسعه و تسعين.

# هەندێك لە ئاوەڵفرمانیە شوێنیەكان

| | |
|---|---|
| اهنه | لێره، ئێره (بۆ نزیك) |
| اهناك | ئەوێ، لەوێ (بۆ دوور) |
| صف | ڕیز |
| بصفي | له تەنیشتم |
| جانب | تەنیشت |
| بجانبي | له تەنیشتم |
| گدام | بەردەم، له پێش |
| گدامك | بەردەمت، له پێشەوەت |
| وره | دواوه |
| وراك | له دواتەوه |
| یسره | ڕاست |
| یمنه | چەپ |
| فۆگ | سەر |
| جَوه | خوارەوه |
| جوّه | لەژێر |
| یَم | لای |
| شرق | ڕۆژهەڵات |
| غرب | ڕۆژئاوا |
| شمال | باكور |

| | |
|---|---|
| جنوب | باشور |
| شرق الأوسط | ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست |
| شرق الأقصى | ڕۆژهەڵاتی دوور |
| آسيا | ئاسیا |
| أفريقيا | ئەفریقیا |
| أوروبا | ئەوروپا |
| أمريكا | ئەمریکا |
| أمريكا الشمالية | ئەمریکای باکوری |
| أمريكا الجنوبية | ئەمریکای باشوری |
| أستراليا | ئوستورالیا |
| قطب الشمالى | بەستەڵەکی باکور ی |
| قطب الجنوبى | بەستەڵەکی باشوری |
| بغداد | بەغداد |
| طهران | تاران |
| دكان | دوکان |
| ساحل | لێوار |
| سوگ | بازاڕ |
| معرض | پێشانگە |
| شارع | شەقام |
| رصيف | شۆستە |
| دربونة | کۆڵان |
| محلة | گەڕەك |

| | |
|---|---|
| مدينة | شار |
| دولة | دەوڵەت |
| قارة | كیشوەر |
| سمه | ئاسمان |
| گاع | زەوی |
| وادي | شیو |
| جهنم | دۆزەخ |
| جنه | بەهەشت |
| فوگ آلگع | لەسەر زەوی |
| جوّه آلگع | لە ژێر زەوی |
| فوگ آلسطح | لە سەربان |
| فوگ آلرأس | لەسەر سەر |
| بصف آلحايط | لەلای دیوار |
| يم الدوكان | لای دوكانەكە |
| جوّه آلبيت | لەناو ماڵەكە |
| جوّه آلمطر | لە ژێر باران |
| خلي يوگف اهنايه | با لێرەدا بوەستێت |
| روح اهناك شويه | تۆزێك برۆ ئەولاوە |
| أگف لگدام | لە پێشەوە بوەستە |
| أرجع لوره | برۆ دواوە |
| أگف يمّك | لای خۆت بۆستە |

## ئاوەڵفرمانە کاتیەکان

ئەوەی لە باسی (ڕۆژ، مانگ و ساڵ) و هەروەها (دوێنێ، ئەمڕۆ و بەیانی) دا هاتووە، هەموویان ئاوەڵفرمانی کاتین.

دەکرێت یاسایەکی کورت بۆ چۆنیەتی دروستکردنی ئاوەڵفرمانێکی کاتی بە ژمارەوە دابنێین، ئەویش:

گبل (یان) قبل + ژمارەی ویستراو + یوم ئاوەڵفرمانی کاتی.

گبل (یان) قبل + ژمارەی ویستراو + اسبوع ئاوەڵفرمانی کاتی.

گبل (یان) قبل + ژمارەی ویستراو + اشهر ئاوەڵفرمانی کاتی.

گبل (یان) قبل + ژمارەی ویستراو + سنه ئاوەڵفرمانی کاتی.

(یـــان):

گۆڕینی ووشەی (قبل) بە (بعد) ووشەی (قبل) بۆ رابردوو بەکاردەبرێت. ووشەی (بعد) یش بۆ داهاتوو.

گبل عشرین سنه پێش بیست ساڵ لەمەوبەر.

# ژمارەو ژماردن

ژمارە، ئەمرۆکە بۆتە بنچینەیەك و بنەمایەکی هەرە گرنگ لە قسەکردندا. ئاشکراشە لە بۆ زانینی ڕۆژ، مانگ و ساڵەکان و هەروەهاش بۆ دیاریکردنی ژمارەی کەس و شتەکان بەکاردەبرێت. جاری وەهاش هەیە لە بری (ناو و ڕاناو) یش بەکاردەبرێت. لەلایەکی تریشەوە، بەوەی ئەمڕۆ ڕاڤەکردنێکی ئابوریانە لە ئارادایە و زێتر پشت بە ژمارەش دەبەستێت، لێرەویە پێویستیەکی زۆر بۆ زانینی ژمارەو ژماردن هەیە.

| | |
|---|---|
| – الیوم خمسه بالشهر. | ئەمڕۆ، پێنجی مانگە. |
| – شفت ثنیناتهم. | هەردوکیانم بینی. |
| – أرید أربع کیلوات. | چوار کلیۆم ئەوێت. |

**لە ( ١ ) وە بۆ ( ١٠ ):**

| | |
|---|---|
| واحد. | یەك. |
| ثنین. | دوو. |
| تلاثه. | سێ. |
| أربعه. | چوار. |
| خمسه. | پێنج. |

| | |
|---|---|
| ستە. | شەش. |
| سبعە. | حەوت. |
| ثمانیە. | هەشت. |
| تسعە. | نـــۆ. |
| عشرە. | دە. |

ت /١/ لەکاتی دیاری کردنی کراو یان ژمێردراودا، پێویستە ئەوە ڕەچاو بکرێت کە لە (٣)ەوە بۆ (١٠)، بزوێنەکانی لێ دەکرێتەوە.

| | |
|---|---|
| تلاث کیلوات. | سێ کیلۆ. |
| عشر نفرات. | دە نەفەر. |

ت /٢/ بۆ ژمارە یەك، زۆر بەدەگمەن و لە هەندێك شوێنی تایبەتدا نەبێت، (واحد) بە تەنیا ناهێنرێت.

اجە فد واحد علیك. زەلامێك هات بۆلات.

بە واتایەکی تر، زۆرجار (فد)ی لەگەڵدا بەکاردەبرێت. ئەگەر بۆ (شت) یش بوو، ئەوا ژمارە یەك ناوترێت و تەنیا (فد + شتەکە) دەوترێت:

| | |
|---|---|
| فد جگارە. | جگەرەیەك. |
| فد کیلو. | کیلۆیەك. |
| فد کرسی. | کورسیەك. |

ت /٣/ بۆ ژمارە دووش، دەکرێت جۆرە باوەکەی کە ئەویش بۆ مرۆڤ (نفرێن) (یان) ثنین بەکار ببرێت.

**لە (١١) وە بۆ (٢٠):**

| | |
|---|---|
| أدعش. | (١١) |
| ثنعش. | (١٢) |
| تلاتعش. | (١٣) |
| ارباتعش. | (١٤) |
| خمستعش. | (١٥) |
| ستعش. | (١٦) |
| سباتعش. | (١٧) |
| ثمنتعش. | (١٨) |
| تساتعش. | (١٩) |
| عشرین. | (٢٠) |

ت /١/ ئەوەی لە شێوازی ژماردنی ئەم لیستەدا بەدی دەکرێت، ئەمەیە کە ئەوە دەبینرێت کە بەشێك لە دەربڕینی ژمارەکانی خانەی (یەکان)، دەخرێتە سەر پاشگرێك کە نیشانەی ژماردنی ئەم ژمارەیەی ئەم لیستەیە یەکە ئەویش (عش) و (تَعَش)ە.

ت /٢/ لە ژمارە پانزەدا، ئەوە نیە کە یەکسەر (یەك) بهێنرێت و بلکێنرێت بەو پاشگرەوە، بەڵکو بە هیچ شێوەیەك (واحد) ناهێنرێت. بەڵکو (أدعش)ە!.

ت /٣/ لە ژماردنی ئەو ژمارانەدا، پێویست دەکات (ت) تای پاشگری (تعش) بە شێوەی (ط) دەرببرێت بەڵام بە طایەکی سوك.

ثمنتعش.        ثمنطعش.

**له (٢١) وه بۆ (٩٩):**

لیرەوە چیتر ئەو قورساییە لە ژماردندا کەم دەبیتەوەو ئاسانی و سانیيەك لە ژماردندا بەدی دەکریت. دەکریت بە ئاسانی ئەم شیوازو یاسا ئاسانە لەبۆ ژماردن بەکاربریت:

| | |
|---|---|
| واحد + و + عشرين | (٢١) |
| ثنين + و + عشرين | (٢٢) |
| ثلاثه + و + ثلاثين | (٣٣) |
| أربعه + و + أربَعين | (٤٤) |
| خمسه + و + خمسين | (٥٥) |
| سته + و + ستين | (٦٦) |
| سبعه + و + سَبعين | (٧٧) |
| ثمانيه + و + ثمانين | (٨٨) |
| تسعه + و + تسعين | (٩٩) |

**واتـــه:**

| | |
|---|---|
| واحد و عشرين | (٢١) |
| ثنين و ثلاثين | (٣٢) |
| ثلاثه وأربعين | (٤٣) |
| أربعه و خمسين | (٥٤) |
| خمسه وستين | (٦٥) |
| سته و سبعين | (٧٦) |
| سبعه وثمانين | (٨٧) |

ثمانیه وتسعین (٩٨)

ت /١/ هەر ژمارەیەك لە یەکاندا، دەکرێت بە هەمان شێوەی سەرەوە لەگەڵ هەر ژمارەیەکی خانەی (دەیان)دا لە یەك بدرێت. واتە بە هەمان شێوەی ژماردنی ژمارە لە کوردیدا ئەنجام دەدرێت.

ت /٢/ بەڵام پێچەوانەی تەواوی شێوازی ژماردن لە کوردیدا، لە زمانی عەرەبیدا ژمارەی (تاك) – واتە یەکان – لە پێش (دەیان)ەوە دەوترێت.

لە کوردیدا (٩٩) نەوەدو نۆ.

بەڵام لە عەرەبیدا (٩٩) تسعە وتسعین.

**لە (١٠٠) وە بۆ (٩٩٩):**

بە زانینی شێوازی ژماردنی ژمارەکانی (یەکان) و (دەیان) هەموو ژماردنەکانی تری ژمارەکان، ئاسان دەبێت و قورساییەکی ئەوتۆ ناکەوێتە سەر شانی خوازیارانی فێربوونی چۆنیەتی ژماردن. لێرەوەیە سەرەتا بە زانینی وشەی (میە) سەد چیتر قورساییەك نامێنێت. بۆیە لێرەشەوە دەست بە ژماردن دەکرێت:

| | |
|---|---|
| میە | (١٠٠) |
| میتێن | (٢٠٠) |
| تلاث میە | (٣٠٠) |
| أربع میە | (٤٠٠) |
| خمس میە | (٥٠٠) |

ست میه (٦٠٠)

سبع میه (٧٠٠)

ثمان میه (٨٠٠)

تسع میه (٩٠٠)

ت /١/ لێرەدا ئەوەی بەدی دەکرێت، تەنیا ووشەی (میە) وو (میتێن) شتێکی تازەیە. بەڵام لە سێ سەدەوە تەنیا بەزیادکردنی ژمارەی (یەکان) – بەڵام بە لێ کردنەوە (ە)ی و زیادکردنی (میە) ژمارەی سەدان لە سێ سەدەوە بۆ نۆسەد، دەسازێنرێت.

| | |
|---|---|
| تلاثە – ە + میە | تلاث میە |
| ثمانیە – ە + میە | ثمان میە |

ت /٢/ بەڵام بۆ (١٠٠) ناکرێت بووترێت (واحد میە)، بەڵکو خودی (میە) سەدەکەیە.

ت /٣/ هەروەها لە (٢٠٠)یشدا. شێوازێکی لارکراوەی ڕێزمانی عەرەبی لە ژماردنی ئەو ژمارەیەدا ڕچاوکراوە، بەڵام بە لارکراوەی. لە عەرەبی فوصحادا (مائتان) بۆ حاڵەتی (رفع)ە و (مائتین) لە حاڵەتی (نصب) و (جر)دایە. ووشەی (میتێن) یش هەمان (مائتین)ی فوصحایە بەڵام بە تێك شکاوی.

ت /٤/ بۆ ژماردنی ژمارەکانی تری خانەی (سەدان)یش، ئەوا دەکرێت ئەم شێوازە بەکاربېرێت:

| | |
|---|---|
| ميه + و + واحد | (١٠١) |
| ميتين + و - اتنين | (٢٠٢) |
| تلاث ميه + و + تلاته | (٣٠٣) |
| اربع ميه + و + اربعه | (٤٠٤) |
| خمس ميه + و + خمسه | (٥٠٥) |
| ست ميه + و + سته | (٦٠٦) |
| سبع ميه + و + سبعه | (٧٠٧) |
| ثمان ميه + و + ثمانيه | (٨٠٨) |
| تسع ميه + و + تسعه | (٩٠٩) |
| ميه + و + عشرين | (١٢٠) |
| ميتين + و تلاثين | (٢٢٠) |
| تلاث ميه + و اربعين | (٣٤٠) |
| خمس ميه + و + سيتن | (٥٦٠) |
| ست ميه + و + سبعين | (٦٧٠) |
| سبع ميه + و + ثمانين | (٧٨٠) |
| ثمان ميه + و + تسعين | (٨٩٠) |
| تسع ميه + و + تسعين | (٩٩٠) |
| ميه + و + واحد + و + عشرين | (١٢١) |
| ميتين و تنين و تلاثين | (٢٣٢) |
| تلاث ميه و تلاث و اربعين | (٣٤٣) |
| اربع ميه و اربعه وخمسين | (٤٥٤) |
| خمس ميه و خمسه و ستين | (٥٦٥) |

| | |
|---|---|
| ست میه و سته و سبعین | (٦٧٦) |
| سبع میه و سبعه و ثمانین | (٧٨٧) |
| ثمان میه و ثمانیه و تسعین | (٨٩٨) |
| تسع میه و وتسعه و تسعین | (٩٩٩) |

**له (١٠٠٠) وه بۆ (٩٩٩,٠٠٠) هەزار:**

خانەی هەزاران، بەوەی تا ئێرە زۆر ئەرکی لە خوێنەر سوك کردووە، قورساییەکی ئەوتۆ لەسەر شانیان نابێت. بە سەرنج دانێکی کەم، وشە تازەکانی ئەم خانەیە زۆر بە خێرایی دەردەکەوێت. کە ئەویش (ألف) هەزار، (ألفین) دوو هەزار، (تالاف) کەوەك هەزاری کوردی وایە لەو کاتانەدا کە زیتر لە دوو هەزار بێت:

| | |
|---|---|
| ألف | (١٠٠٠) |
| الفێن | (٢٠٠٠) |
| تلات تالاف | (٣٠٠٠) |
| أربع تالاف | (٤٠٠٠) |
| خمس تالاف | (٥٠٠٠) |
| ست تالاف | (٦٠٠٠) |
| سبع تالاف | (٧٠٠٠) |
| ثمان تالاف | (٨٠٠٠) |
| تسع تالاف | (٩٠٠٠) |
| عشر تالاف | (١٠,٠٠٠) |

ت /١/ ئـــەوەی زۆر بـــە ئاشـــکرا دەبینرێـــت، ئەوەیـــە کـــە ژمارەکـانی خانـەی (یـەکان) دەخرێنـە سـەر (تـالاف) و ژمـارەی سـێ تـا دەهـەزار پێـك دەهێنـرێن. بـەڵام هـەروەك لەسەدانیـشدا بەدی کرا، بە لابردنی (ە)ی ژمارەکانی سێ بۆ (١٠).

ت /٢/ بۆ زانینی چۆنیەتی ژماردنی ژمارەکانی نێو ئاخنی ئـەو ژمارانـەش، هـەمان یاسـای پێـشوی (سـەدان سـازی) بەکاردەبرێت:

| | |
|---|---|
| ألف + و + واحد | (١٠٠١) |
| ألفين و ثنێن | (٢٠٠٢) |
| تلات تالاف و تلاثه | (٣٠٠٣) |
| اربع تالاف و أربعه | (٤٠٠٤) |
| خمس تالاف و خمسه | (٥٠٠٥) |
| ست تالاف و سته | (٦٠٠٦) |
| سبع تالاف و سبعه | (٧٠٠٧) |
| ثمان تالاف و ثمانيه | (٨٠٠٨) |
| تسع تالاف و تسعه | (٩٠٠٩) |

ت /٣/ بۆ زانینی (١٠,٠٠٠) بۆ (١٠٠,٠٠٠)، بەم شێوەیە:

| | |
|---|---|
| عشر تالاف | (١٠,٠٠٠) |
| عشرين ألف | (٢٠,٠٠٠) |
| تلاثين الف | (٣٠,٠٠٠) |

| | |
|---|---|
| اربعين الف | (٤٠,٠٠٠) |
| خمسين الف | (٥٠,٠٠٠) |
| ستين الف | (٦٠,٠٠٠) |
| سبعين الف | (٧٠,٠٠٠) |
| ثمانين الف | (٨٠,٠٠٠) |
| تسعين الف | (٩٠,٠٠٠) |
| ميت الف | (١٠٠,٠٠٠) |

ت /٤/ ژمارەی ناوەخنەکانیشی، بەم جۆرەیە:

| | |
|---|---|
| عشر تالاف | (١٠,٠٠٠) |
| ادعش الف | (١١,٠٠٠) |
| ثنعش الف | (١٢,٠٠٠) |
| تلاتتعش الف | (١٣.٠٠٠) |
| اربعتعش الف | (١٤,٠٠٠) |
| خمس تعش الف | (١٥,٠٠٠) |
| ستعش الف | (١٦,٠٠٠) |
| سباتعش الف | (١٧,٠٠٠) |
| ثمانتعش الف | (١٨,٠٠٠) |
| تساتعش الف | (١٩,٠٠٠) |
| عشرين الف | (٢٠,٠٠٠) |
| واحد وعشرين الف | (٢١,٠٠٠) |

| | |
|---|---|
| ثنين و تلاثين ألف | (٣٢,٠٠٠) |
| تلاثه واربعين ألف | (٤٣,٠٠٠) |
| أربعه وخمسين ألف | (٥٤,٠٠٠) |
| خمسه وستين ألف | (٦٥,٠٠٠) |
| سته و سبعين ألف | (٧٦,٠٠٠) |
| سبعه و ثمانين ألف | (٨٧,٠٠٠) |
| ثمانيه و تسعين ألف | (٩٨,٠٠٠) |
| تسعه و تسعين ألف | (٩٩,٠٠٠) |

ت /٥/ ئـەوەی لـەم بەشـەدا بـەدی دەکرێـت، تـەنیا بـە زیـادکردنی (تـالاف) و (ألـف) بـۆ خانـەی (یـەکان) و (دەیـان) و بگـرە (سـەدان)یـش، ژمـارەی خـوازراو لـە هەزارانـدا پێـك دەهێنرێت.

ت /٦/ بـۆ زانینـی چـۆنیەتی ژمـاردنی ژمارەکـان لـە (١٠٠,٠٠٠) ەوە بۆ (ملیۆن)، بەم شێوەیە دەبێت:

| | |
|---|---|
| میت ألف | (١٠٠,٠٠٠) |
| میتین ألف | (٢٠٠,٠٠٠) |
| تلاث میت + ألف | (٣٠٠,٠٠٠) |
| أربع میت + ألف | (٤٠٠,٠٠٠) |
| خمس میت + ألف | (٥٠٠,٠٠٠) |

ست میت + ألف (٦٠٠,٠٠٠)

سبع میت + ألف (٧٠٠.٠٠٠)

ثمان میت + ألف (٨٠٠,٠٠٠)

تسع میت + ألف (٩٠٠,٠٠٠)

ملیۆن (١٠٠٠,٠٠٠)

**کـــەواتـــە:**

خانەی سەدان + ألف سەدان هەزار

ت /٧/ بۆ زانینی ناوەخنەکانی ژمارەکانی سەدان هەزار، چ لەگەڵ (یەکان)دا و چ لەگەڵ (دەیان) و چ لەگەڵ (سەدان) و چ لەگەڵ (هەزاران)دا، هەمان شێوازی پێشوو بەکاردەبرێت:

میت ألف + و + واحد (١٠٠,٠٠١)

میتین ألف + و + واحد وعشرین (٢٠٠,٠٢١)

تلاث میت ألف + و + اربع میه و اربعه (٣٠٠,٤٠٤)

تسع میت ألف + و + تلاث میه + و + خمسین (٩٠٠,٣٥٠)

تسع میه و وتسعه وتسعین ألف و تسع میه و تسعه وتسعین (٩٩٩,٩٩٩).

ت /٨/ <u>لە ملیۆنەوە بۆ ملیار:</u>

ملیۆن ١,٠٠٠,٠٠٠

ملیۆنین ٢,٠٠٠,٠٠٠

تلاث ملاین ٣,٠٠٠,٠٠٠

| | |
|---|---|
| تسع ملاين | ٩,٠٠٠,٠٠٠ |
| عشر ملاين | ١٠,٠٠٠,٠٠٠ |
| عشرين مليون | ٢٠,٠٠٠,٠٠٠ |
| تسعين مليون | ٩٠,٠٠٠,٠٠٠ |
| ميت مليون | ١٠٠,٠٠٠,٠٠٠ |
| خمس ميت مليون | ٥٠٠,٠٠٠,٠٠٠ |
| تسع ميت مليون | ٩٠٠,٠٠٠,٠٠٠ |
| مليار | ١٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ |
| مليارێن | ٢٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ |
| تلاث ميت مليار | ٣٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ |
| تسع ميت مليار | ٩٠٠,٠٠٠,٠٠٠ |

گومان لەوەدا نیە کە ناواخنی ژمارەکانیش، هەمان شێوازو شێوەو دەربڕینی ئەو خانانەیان دەبێت کە دەخرێنە سەر ملیۆن و ملیار.

# چـــــاوگ

هەرچـەندەو بـە ڕواڵـەت وا دەردەکـەوێت کـە لـە زاراوەکانـدا هـیچ سەرچاوەیەکی تێدا بەدی ناکرێت و (بێ چاوگ)ە، بەڵام دەکرێت بەدی بکرێت. وە بەوەی ئەم بابەتە زێـتر پشـت بـە توێژینـەوەو لێکۆڵینـەوەی ورد دەبەستێت و دەکرێت خودی (چـاوگ) بابـەتێکی ئاکـادیمی رووت بێت و زێتر تایبەتمەندانی ئەو بوراە قەڵـەمی تێـدا بجـوڵێنن، بـەڵام بـە ناچاری لێرەدا چەند تێبینیەکی خێرا لەسەر ئەو بابەتە دەخرێتـە ڕوو و هەموو باسەکەش نابێت:

ب ١/ هەندێك چاوگ هەن لەسەر كێشی (فَعْلَه)ن وەك:

(نصبه، ختلـه، كتلـه) ئەمانـەو هـاو وێنـەكانیان، كاتێـك بیوسـترێت رابوردویان بسـازێنرێت، ئـەوا تـەنیا بـە لابردنـی (ه) بزوێنـەكانیان و گـۆرینی سـەرۆوبۆر (ن ن) و (لـل)، دەچـێتە رابـوردووەو بـۆ كەسـی سێیەمی تاك بەكاردەبرێت:

| | | |
|---|---|---|
| نصبه | نُصَبْ | رای بوارد. |
| ختله | خْتَلْ | خۆی شاردەوە. |
| كتله | كتَلْ | كوشتی. |
| گلبه | گـلَب | وەرگەڕا، بای دایەوە. |

ب ٢/ هەنـدێك لـەو چـاوگانەی كـە (دووم) پیـت یـان یـەكێك لـە (حروف علـه)ن بـە تایبـەتی (و) واو، ئـەوا لـەكاتی سـازانیاندا (و)ە ئاسان لە رابوردو (وە) رانەبوردو بە (ا) ئەلف دەگۆڕێن:

| | | | |
|---|---|---|---|
| نوم | نام | ینام | نام |

خەوتن خەوت دەخەوێت بخەوە.

ئەمە بۆ کەسی سێیەمی تاک. بەڵام بۆ کەسی یەکەمی تاک و دووەمی تاک، (و) لە رابوردودا لادەبریت:

| | | |
|---|---|---|
| نوم | نمت | خەوتم |
| نوم | نِمْتَ | خەوتی |
| گول | گلتَ | ووتم |
| لوم | لِمْتَ | گلەیم کرد |
| جوع | جُعْتَ | برسیم بوو |
| گومە | گُمَتَ | هەڵسام |
| ضوجە | ضَجْتَ | بێزار بووم |

بەڵام هەندێك ووشە هەن کە رانەبوردویان بەو شێوەیەی لە (ت/٢/)دا باس کرا، پێك نایەت:

| | | | |
|---|---|---|---|
| گولە | اگول | ووتن | ئەڵێم |
| گومە | اگوم | هەڵسان | هەڵدەستم |

وە (و) واوەکەی تەنیا لە حاڵەتی رابوردودا لادەبرێت.

ت /٣/ هەندێك چاوگ هەن کە لە دوو پیت پێك دێن (دزْ، ذبْ)، لە کاتی خستنە دەمێکەوە، تەنیا لە رابوردودا (ا)یك دەخرێتە نێوانیانەوە لە رانەبوردو و فرمانیشدا تەنیا لەسەروبۆردا دەگۆڕێن:

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| دَز | داز | أدز | دز | ناردن... |
| ذَب | ذاب | أذب | ذب | فرێ دان... |

ت /٤/ ئەو چاوگانەی لە زمانی عەرەبی فوصحاوە وەرگیراون و دەسکاری نەکراون، ئەوا بە پێی چاوگسازی لە عەرەبی فوصحادا، دەسازێنرێن، بەڵام بە کەمێك دەسکاری سەروبۆرەوە:

حلف خَلَفْ یَحْلَفُ اُحْلَفْ

سوێند خواردن سوێندی خوارد سوێند دەخوات سوێند بخۆ

ضحك ضْحك یْضحَكْ أضْحَكْ پێ کەنین

رکض رکَض یرکُضُ ارْکُضْ راکردن...

# رانـــــاو

ئەگـەر بێـژەرێك بیـەوێت قـسەیەك بكـات و یـان گوێگرێـك قـسەیەك ببیـستێت، ئـەوا پێویـست دەكـات بزانرێـت كـە (كـام رانـاو) بەكاردەبات وەیان بەكاردەهێنرێت. بە وتایەكی دی، پێویستە بزانرێت كە قسە (سەبارەت بەكێ؟) و (لەگەڵ كێ)، (كێ) قسە بێژو...ە:

**راناوەكان لە دوو دەستەدا خۆیان دەبیننەوە:**

١- راناوی جوێ.

٢- راناوی لكاو.

## ١/ راناوە جوێكان:

| | |
|---|---|
| آنی | من |
| انته | تۆ (نێر) |
| انتِ | تۆ (مێ) |
| هو | ئەو (نێر) |
| هی | ئەو (مێ) |
| احنه | ئێمە |
| أنتو | ئێوە |
| هم | ئەوان (نێر) |
| هن | ئەوان (مێ) |

| | |
|---|---|
| آني رحت. | من رۆیشتم. |
| أنته رحت. | تۆ ڕۆیشتی. |
| هو راح. | ئەو رۆیشت. |
| هي راحت. | ئەو ڕۆیشت. |
| أحنه رحنا. | ئێمە ڕۆیشتین. |
| أنتو رحتو. | ئێوە رۆیشتن. |
| هم راحو. | ئەوان رۆیشتن. |
| هن راحن. | ئەوان رۆیشتن. |

ت / ١ / بۆ هەر سێ دەمەکە (رابوردو، رانەبوردو، داهاتو) بەکاردەبرێت بێ ئەوەی گۆڕانیان بەسەردا بێت.

ت / ٢ / جوێ کەردووەی (ڕەگەز) لە عامیانەشدا هەیەو دەبێت ڕەچاوی بکرێت.

**ت ٣ نیشانەی** (مثنى) **بوون لە عامیانەدا نیە. بەڵکو یان (تاك)ە یان (کۆ).**

**٢ راناوە لکاوەکان:**

**بۆ رابوردو:**

| راناو | کرداری رابوردو | | واتاکەی |
|---|---|---|---|
| ت | رحت | | رۆیشتم |
| ت | رحت | (بۆ نێر) | رۆیشتیت |
| ت | رحت | (بۆ مێ) | رۆیشتیت |
| -- | نیەتی | (بۆ نێر) | رۆیشت |
| ت | راحت | (بۆ مێ) | رۆیشت |
| نا | رحنا | | رۆیشتین |
| تو | رحتو | | رۆیشتن |
| و | راحو | (بۆ نیر) | رۆیشتن |
| ن | راحن | (بۆ مێ) | رۆیشتن |

ت /١/ ئەم ڕاناوانە لەم کاتانەدا (بکەر)ن و هەڵساون بە کردنی کارەکە.

**له رانەبوردو و داهاتودا:**

| | | | |
|---|---|---|---|
| أ | أروح | دەرۆم | |
| ت | تروح | دەڕۆی | (بۆ نێر) |
| ت | ترحين | دەڕۆی | (بۆ مێ) |

| | | |
|---|---|---|
| ی | یروح | دەڕوات |
| ن | نروح | دەڕۆین |
| ت | ترحون | دەڕۆن (بۆ نێر) |
| ت | ترحین | دەڕۆیت (بۆ مێ) |
| یـ | یرحون | دەڕۆن (نێر) |
| یـ | یرحن | دەڕۆن (مێ) |

ت /١/ دەبێت ڕەچاوی ئەوە بکرێت کە بۆ کەسی یەکەم و دووەم و سێیەمی کۆ، نیشانەی (کۆ) بوونیان پێوە بێت.

ت /٢/ لێرەدا پێویست دەکات ئەوە بگوترێت کە ئەم کۆمەڵە راناوانەش، ڕاناوێکن کە کە (بکەر)ن و هەڵساون (وەیان) هەڵدەستن بە کردنی کارێك بۆیە (راناوی بکەر) یان پێ دەگوترێت.

ت /٣/ بەڵام جۆری تریش لە راناو هەن، کە بە پێویست نەزانرا بهێنرێنەوە. بەڵکو تەنیا یەك کۆمەڵی تر هەن کە پێویستە ئاماژەیان پی بدرێت کە ئەویش ئەو راناوانەن کە یان (بەرکار) یان (خاوەنیەتی) نیشان دەدەن کە ئەمانەن:

| راناو | نمونە | واتا |
|---|---|---|
| ی | کتابی | کتێبەکەم |

| | | |
|---|---|---|
| ك | كتابك | كتێبەکەت (نێر) |
| چ | كتابچ | كتێبەکەت (مێ) |
| نا | كتابنا | كتێبەکەمان |
| كم | كتابکُم | كتێبەکەتان (نێر) |
| چن | كتابچن | كتێبەکەتان (مێ) |
| هم | كتابهُم | كتێبەکەیان (نێر) |
| چن | كتابچن | كتێبەکەیان (مێ) |

ت /٤/ ئەم کۆمەڵە راناوانە (بکەر) نین و تەنیا (خاوەنەیتی) وەیان حاڵەتی (بەرکاری) نیشان دەدەن.

## بۆ زانینی جۆری داوا

گومان لەوەدا نیە کە گەر بویستریێت بزانریێت بەرامبەر (وەیان) ئەو کەسەی دەویستریێت داوای بزانریێت، زۆر شێواز هەیە بۆ زانینی. بەڵام دەکریێت لە دوو جۆری سەرەکیدا پۆلێن بکریێت، ئەویش شێوازی (باش)و شێوازی (خراپ).

شێواز هەیە لە ڕێگای بەکارهێنان و بەکاربردنی شێوازە ئاکاریە بەرزەکانەوەیەو (ڕێز)، وەك پایەی پێزانینی بۆ بەکار دەبریێت:

١- بێش اخدمك؟ چۆن خزمەتت بکەم؟

| | |
|---|---|
| ٢- اغاتي شتريد؟ | ئازيزم چيت دەوێت؟ |
| ٣- اتفضلوا؟ | فەرموون؟ |
| ٤- شتحبون؟ | خۆشتان لە چی دێت؟ |
| ٥- شتأمرون؟ | فەرمانتان چىيە؟ |
| ٦- أگدر أخدمك؟ | ئەتوانم خزمەتتان کەم؟ |
| ٧- عيوني أمُر؟ | چاوەکەم فەرمان بدە؟ |
| ٨- شتريد أخي؟ | چيت ئەوێت براکەم؟ |

ت /١/ گومان لەوەدا نیە کە جۆری دەربڕین و سیمای دەم و چاو و لەش و لارو وەستان، هەموو ئەمانە یارمەتی دەری (گەیاندن) و (تەواوکردن) و (دەرخستن)ی جۆری داواو شێوازی داواکە دەردەخات.

ت /٢/ گومانیش لەوەدا نیە کە جۆری دەربڕینی هەندێك پرسیارکردن لە بۆ زانینی داوا، ڕێز بە شێوەیەکی دی لەکاتی قسەکردندا خۆی دەنوێنێت. بۆ نموونە کاتێك کەسێکی بەتەمەن لەگەڵ کەمتر لە تەمەنی خۆیدا بە چەند ساڵێك قسە دەکات، ئەوا هەندێك وشەی وەك ئەمانەی خوارەوە بەکار دەبات:

| | |
|---|---|
| (ولێدی) | کوڕەکەم |
| إبنی | کوڕەکەم |
| یابە | باوکە |

ت /٣/ بۆ وەڵامی ئەو شێوازەی کە بەڕێزەوە بەکار دەبرێت، دەکرێت وەڵامی جیاجیایان هەبێت:

– ئەوەی (بێش أخدمك؟)ی ووت، ئەوا پێش نیازو داواکەی بڵێت. (خادم ربك) وەك وەڵامی ئەو ڕێزە بەکاربېرێت و پاشان (داوا) بووترێت.

أغاتي شتريد؟

وەڵام: أغاتك ربك......

اتفضلوا؟

وەڵام: زاد فضلك. فەزڵت زۆر بێ......

شتأمرون؟

لا يأمر علينه ظالم. (زاڵم ئەمر نەکات).

عيوني أُمر؟

وەڵام: ١/ تسلم عيونَك. (چاوتان خۆش بێت).

٢/ لا يأمر علينه ظالم. (زاڵم ئەمر نەکات).

شێوازی تریش هەیە بۆ پێزانین کە دەکرێت لە ووشەی (شتريد؟) چيت دەوێت علوێش تدور؟ بۆچی دەگەڕێیت؟ کەڵك وەرگیرێت بەڵام جوانترە بە ڕێزەوە قسە بکرێت.

## وەڵام دانەوەی داوا

بۆ وەڵام دانەوەی داوا چ بە (ئەرێ) و چ بە (نەرێ)، دەکرێت ئەم شێوازە بەکار ببرێت:

**بۆ (ئەرێ):**

| | |
|---|---|
| صار | بەسەرچاو. |
| بعيني | بەبان چاو. |
| بالخدمه | لە خزمەتام. |
| دللْ | ناز بکە (فەرمانە). |
| أگدر | دەتوانم. |
| هسه | هەر ئێستا. |
| تأمْر | فەرمان ئەدەیت (فەرمانە). |
| ليش لا | ئەی بۆنا. |
| غالي والطلَبْ رخيص | ڕێزت هەیە. |

**بۆ (نەرێ):**

| | |
|---|---|
| ما يصير | نابێت. |
| ما أگدر | ناتوانم. |

# چەند جۆرێك لە داوا كردن

گومان لەوەدا نیە كە یەكێك لەو ڕێگە هەرە باو و شێوازە گرنگانەی كە لەنێوان مرۆڤەكاندا بۆ (حاڵی بوون) (حاڵی كردن) (لێك گەیشتن) و (پەیوەندی كردن) هەر لە كۆنەوەو تا ئێستاش باوە، ئەوە شێوازەیە كە بۆتە سیمایەك لەبۆ (زمان داری) و (ژیری بوون)ی مرۆڤ بگرە وەك (مەبەست) و (هۆكار)یش سەیری دەكرێت كە ئەویش (داواكردن)ە. داوا زۆرجار وەك (پێویستیەك)ی هەرە گرنگ خۆی بەسەر مرۆڤدا دادەسەپێنێت و دەبێتە ئەو هۆكارەی كە (پێوستیەكان)ی لەرێوە دەردەبڕێت. بێ دوو دڵیش دەتوانین بڵێین كە بەوەی مرۆڤ بە گشتی (پێویستی) بە دابێن كردنی پێویستیەكانی هەردوو پێكهاتەی (جەستەیی) و (دەروونی) و لایەنەكانی هەیە، هەر بۆیە داواكردن و خوازەكانیشی هەردوو لایەن دەگرێتەوەو لە دواكردننندا، داوای جەستەیی و داوای دەرونی دەردەبڕێت و دەیخوازێت.

ئەمەش بەو واتایە نیە كە ئەو ووشانەی لەبۆ داواكردن بەكاردەبرێن، دوو جۆر بن و جیاوازیان لە ووشەدا هەبێت، بەڵكو هەمان ووشەن و جیاوازیەكیان لە نێواندا نیە. بەڵكو جیاوازی لە (جۆری داوا) كەدا و ئەو پێویستیانەدا

دەردەکەوێت کە لە پاش ئەو ووشانە و پێشیانەوەن. لێرەوەیە کە دەکرێت لەم ووشانە کەڵك وەربگیرێت بۆ هەردوو لایەنەکە:

**١- عـــفـــواً:**

لەو کاتەدا کە مرۆڤ دەیەوێت لە شتێك بپرسێت و ئەو هەستەی لە دەرونیدایە کە (ئەو پرسینە) یان (ئەو داوایە)ی کە دەیکات ئەرکێك و قورساییەك دەخاتە سەرشانی بەرامبەرەکەی، لێرەوە ئەو هەستە دەکات کە پێویستە لەسەری (داوای لێ بوردن)ی لێ بکات.

هەروەها دەشکرێت وەك (وەڵام)یش بەکاربربێت و هەمان مەبەستیشی لەدوا بێت. بەڵام بەوەی کە هیچ قورساییەك و ئەرکێك نەبووە.

| | |
|---|---|
| عفواً ضوجناکُم؟! | ببورن بێزارمان کردن. |
| عفواً أخي... | ببورن برام... |
| عفواً أريد... | ببورن ئەمەوێت... |
| عفواً آني... | ببورن من... |

**٢ عُذراً:**

ئەم ووشەیەش، هەمان ماناو واتای ووشەی پێشوی هەیە، بەڵام و لەگەڵ ئەوەشدا بەو وتایەش دێت کە (هۆیەك هەیە بۆ داواکە).

| | |
|---|---|
| عُذراً. اگدر... | ببورە، دەتوانم... . |
| عُذراً، وين صاير...؟ | ببورە (فلان شوێن).. کەوتۆتە کوێوە؟ |

**٣ أريد:**

ووشەی (دەمەوێت)، لەو ووشانەیە کە (ڕاستەوخۆ) و بێ هەڵگرەکان، داوای پێ دەخوازێت. وەلەبەر زۆری بەکارهێنانی، حاڵەتی ڕێزمانی یەکەی و لە کاتێکدا (ڕاناوە لکاوەکانی) پێوە لکابێت، بەم شێوەیە دەردەبڕێت:

| | |
|---|---|
| أريد (ئەمەوێت) | نريد (دەمانەوێت) |
| تريد (دەتەوێت) | تردون (دەتانەوێت) |
| يريد (دەیەوێت) | يردون (دەیانەوێت) |

**٤- أگدر:**

هەروەك لە شوێنی تریشدا باس کرا، ئەم ووشەیەش دەکرێت لە ڕوی (توانا)وە، باس لە داوایەك بکرێت:

| | |
|---|---|
| أگدر (دەتوانم) | نگدر (دەتوانین) |
| تگدر (دەتوانی) | تگدرون (دەتوانن) |
| يگدر (دەتوانێ) | يگدرون (دەتوانن) |

**٥- الله يخليك:**

هەمان ووشە، دەکرێت شێوەیەك لە داواکردن بە پاڕانەوەوە بێت (یان) شێوەیەك لە (نزای خێر) کردن بێت بۆ بەرامبەر.

**الله يخليك، آني مستعجل...** خوا بت پارێزێ زۆرم پەلەیە...

**الله يخليك، خليني اروح...**خوا بت پارێزێ، بهێڵە بڕۆم...

٦ بلا زحمة:

ئەم ووشەیەش، بەوەی داواکردن (ئەرکێك) دەخاتە سەر شانی بەرامبەر، هەر لە سەرەتاوە بێژەر داوای ئەوە لە بەرامبەر دەکات کە (بە ئەرك نەبێت):

بلا رحمە أرید...    بە ئەرك نەبێت دەمەوێت...

بلا زحمە اگدر...    بە ئەرك نەبێت دەتوانم

ب ئەوەی لەو دوو ڕستە ناتەواوەدا بەدی دەکرێت، ئەوەیە کە دەکرێت چەند ووشەیەکی داواکردن بەسەریەکەوە بەکارببرێت...

# توانین و مۆڵەت و ڕێ پێدان

***بەربڵاوی بەکارهێنانی (تیۆری هێز) و ڕاچوونی بۆ نێو هەموو بیرکردنەوەو ئاخاوتن و کرداری مرۆڤ، بۆتە هۆیەك كە بەكارهێنانی لە مرۆدا زۆر بێت و بواری جیاش بگرێتەوە. دەكرێت بە گشتی لە سێ بواردا بەكارهێنانەكانی ببینرێتەوە:***

***بواری هزری:***

***تكدر تفكر و توصل لنتيجه***

دەتوانیت بیر بكەیتەوە بگەیت بە دەرئەنجامێك.

***بواری ئاخاوتن:***

| | |
|---|---|
| شلون گدرت تگله؟! | چۆن توانیت پێی بڵێیت؟! |
| أگدر أگوله. | ئەتوانم پێی بڵێم. |

***بواری کرداری:***

| | |
|---|---|
| أگدر اكُل؟! | ئەتوانم نان بخۆم؟! |
| أگدرانام؟! | ئەتوانم بخەوم؟! |
| أگدر أخابر؟! | ئەتوانم تەلەفۆن بکەم؟! |

اكدر ما أخلى يروح! ئەتوانم نەهێڵم بڕوات!

نگدر تجيب خمس چايات؟ ئەتوانیت پێنج چا بهێنیت؟

أگدر أشيل ٧٥ كيلو. ئەتوانم ٧٥ کیلۆ هەڵبگرم.

ت/١/ دەکرێت بۆ مۆڵەت وەرگرتن و مۆڵەت دان بەکاربرێت:

أگدر أخابر؟ ڕێگە دەدەیت تەلەفون بکەم؟

ت/٢/ دەکرێت بۆ دەست نیشانکردنی (تواناکان) بەکاربهێنرێت:

أگدر اركُض. ئەتوانم رابکەم.

ت/٣/ دەکرێت بۆ دەست نیشانکردنی (بڕی قورسایی) بەکاربهێنرێت:

نگدر تشيل هالكرسي؟ ئەتوانیت ئەم کورسیە هەڵبگریت؟

# مۆڵەت وەرگرتن بە گشتی

هەموو پێکهێنەرێکی دەرونی ناوەکیانەی مرۆڤ، ئاگایانەو نائاگایانە بەردەوام باوەڕی وایە لە کەوانەیەکدا دەژی کە سنورەکانی دیکە هەن و پێویستی بە ڕێنمایی و مۆڵەت دان لەو بوارەدا هەیە. ئەمەش وای کردووە کە (چاودێر) و بوونی چاودێر و ڕێ پێدەر، بەردەوام بە پێویستیەکی سەرەکی و بنەمایی بزانێت. هەرچەندە لای هەندێك و چەشنێك وای کردووە (خود) یکی نەمێنێت و (لەوی دی) دا بژی و بۆی بژی. لەلای مرۆڤی ژیریش بۆتە هۆی (یاسا ڕێژی) و سنوردانان و دیاری کردن و هێنانەکایەوەی (بەها بەرزەکان) و نەریتێکی ئاکاریانەی جوان. لێرەوەیە بە ووردبوونەوە لەو ووشانەی کە لەم بوارەدا بەکاردەبرێت هێڵە باریك و ناسکە دەرونیەکانی مرۆڤیش تووێیکی هەرچەندە ڕواڵەتیش بێت، دەردەکەوێت:

| | |
|---|---|
| تسمح | ڕێگە دەدەیت، مۆڵەت دەدەیت |
| أگدر | ئەتوانم |
| تخلینی | دەهێڵێت |
| بکیفك | بە مەیلی خۆت |

| | |
|---|---|
| بكيفك | بە مەیلی خۆت |
| اللی یعجبك | ئەوەی پێت خۆشە (لات پەسەندە) |
| اریدك | وا دەمەوێت لێت |
| ارجوك | تکایە |
| بلا زحمة | بێ زەحمەت |
| اللی تگول | ئەوەی دەیڵێیت |
| الله یخلیك | توخوا، خوا بت هێڵێت |
| ماتحچی | قسە ناکەیت ، هیچ نالێیت |
| ما تصیر عصبی... | تورە نابیت |
| شلۆن ترید... | چۆن دەتەوێت |
| تسمح لی أورح؟ | ڕێگەم پێ دەدەیت بڕۆم؟ |
| أگدر أجي وياكم؟ | ئەتوانم بێم لەگەڵتان؟ |
| تخليني أسلم عليهُم؟ | ئەهێڵیت سڵاویان لێ بکەم؟ |

بكيفك، شترید أسوی!

مەیلی خۆتە ،چیت دەوێت ئەنجامی دەدەم!

| | |
|---|---|
| تریدنی ما أخليهُم؟ | ئەتەوێت ڕێگەیان پێ نەدەم؟ |
| أرجوك ، أستریح | تکا دەکەم دانیشە. |
| بلا زحمە شویە مای؟ | بەئەرك نەبێ کەمێك ئاو؟ |
| ماتحچي إذا جبتهم؟ | قسە ناکەیت ئەگەر هێنامن؟ |

# نـــــەریٚ کـــــردن

بـۆ نـەریٚ کـردن، دەکرێـت لـە ووشـەی (لا)، (مـو)،(مـا) کـەڵك وەربگیرێت.

| | |
|---|---|
| لا | نەء |
| ما | نا |
| مو | نا (نیە) |
| لا؛ ما أريد | نەخێر (نامەوێت) |
| لا، هسە راح | نەء، ئێستا ڕۆیشت |
| لا، هو گاعد | نەء، ئەو بە خەبەرە |
| لا، كلش مو حلو | نەء، زۆر ناشرینە. |
| لا، كلش حلو | نەء، زۆر جوانە. |
| لا، باچر راح أجی | نەء، بەیانی یەم. |
| ما يَعرُف | نازانێت |
| ما يدري | نازانێت |
| ما ينام | ناخەوێت |
| ما يخليني | ناهێڵێت |
| ما ينگـضی | بەسەر ناچێت، ناڕوات |
| ما يجي | نایەت |

| | |
|---|---|
| ما يرحون | ناچن |
| ما يخافون | ناترسن |
| ما يگول | نایلێت، نالێت |
| ما أصير عصبي | تورە نابم |
| ما يعرف يحچي | نازانێت قسە بکات |
| ما يتأخر | دوا ناکەوێت |
| ما يريد | نایەوێت |
| ما يشوف | نابینێت |
| ما يأكل | ناخوات |
| ما يهمني | بەلامەوە گرنگ نیە |
| ما يلوگلي | لێم نایەت |
| ما يحاچيني | قسەم لەگەڵدا ناکات |
| ما يخاف | ناترسێت |
| ما أعاند | کەلەڕەقی ناکەم |
| ما يشتغل، مو زين. | ئیش ناکات، باش نیە. |
| موزين عليك. | بۆت باش نیە. |

ت/ بەم پێیە دەکرێت ئەو ووشەی دەتەوێت نەرێی بکەیت، تەنیا بەبەردەم خستنی و کردنی بە پێشگری ئەو ووشەیە، ئەوا هەرسێ ووشەکە کاری نەرێ کردن دەکەن:

**يعرف ---- ما يعرف ئەزانێت - نازانێت**

**يشتغل --- ما يشتغل كار ئەكات - كار ناكات**

**يـــان:**

**لا + ما + وشەكە --- وشەی نەرێ كراو**

**لا + ما + أروح ---- نا ؛ ناڕۆم**

## ڕاپرسی، ڕازانی

زۆرجار لەلایەن بێژەرەوە شتێك دەگوترێت و هەوڵیش دەدات كە ڕای بەرامبەر یان كەسێكی دیكە لەڕێی بەرامبەرەوە، بزانێت. ئەم كارەش جاری وەها هەیە ئاگایانەو هەندێك جاریش، نائاگایانە ئەنجام دەدرێت. لەڕێی ئەم رستە ناتەواوانەو دەستەواژانەوە، دەكرێت ئەو كارە ئەنجام دەدرێت:

١- **شتگول...؟:**

(چی دەڵێیت)، لە ڕێی بەكارهێنانی ئەم ووشەیەوە، دەكرێت (قسەی گوێگر)و راكەی بزانرێت بەرامبەر ئەو شتەی پرسیاری لەبارەیەوە دەكرێت.

- شتگول، نروح؟ ئەڵێی چی، بڕۆین؟

شتگول، اسوی هیچی؟ ئەڵێی چی، وابكەم؟

ت/ دەكرێت لە ئاوەڵفرمانی كاتی (هسە) كەڵك وەرگرێت و (رای ئێستا)ی گوێگر بزانرێت:

هسە شتگول؟ ئێستا ئەڵێی چی؟

٢- **شتتصور...؟:**

(چۆن لێکی دەدەیتەوە) بۆ ڕاپرسی سەبارەت بەو (وێنەیەیە کە لە مێشکی گوێگر دایە).

٣- **شتشوف...؟:**

(چی ئەبینی)، هەوڵێکە بۆ زانینی دیدو ڕوانگەی بەرامبەر و چۆنیەتی بینینی.

٤- **شنو رأيك؟:**

(رات چیە) بۆ زانینی ڕاستەوخۆی (ڕای بەرامبەر).

٥- **شنسوي؟:**

چی بکەین؟، بۆ زانینی ڕای بەرامبەر بەو دەرئەنجامەی کە پێویست دەکات ئەنجام بدرێت.

٦- **هيچي مو أحسن؟:**

(ئاوا باشتر نیە)، بۆ گەڕان بە دوای ڕێگا چاریەکی باشتر بەڵام بە ڕاپرسی لە بەرامبەر.

٧- **صَح لو لا؟:**

(ڕاستە یان نا؟)، ئەمەش هەوڵێکە بۆ ڕازانی بەرامبەر بە ڕاستی یان ناڕاست بوونی ئەو شتەی سەبارەتی دەدوێن.

٨- **يعجبك؟:**

(بە دڵتە) (پەسەندی دەکەیت) ئەمەش بۆ زانینی ڕای بەرامبەرو لاپەسەندبوون یان نەبوون.

٩- **أعتقد:**

(بڕوام وایە..؟)، بۆ دەرخستنی بڕوای بێژەر کە خۆی لە خۆیدا جۆرێکە لە دەرخستنی (ڕا) و بەیان کردنی ئەوەی لە مێشك و هزردایە. ئەمەش هەندێك جار دەبێتە هۆی (ڕادان) لەسەری.

١٠- **أتصور؟:**

(وا بۆی دەچم) (ڕام وایە)و...، بۆ دەرخستنی ئەو وێنەیەیە کە بێژەرەکەی سەبارەت بە بوونێك هەیەتی.

١١- **يمكن نگدر...:**

(ڕەنگە بتوانیم) بۆ دەرخستنی ڕادەی توانا سەبارەت بەشتێك.

١٢- **شلون مانگدر؟:**

(چۆن ناتوانین؟) لەو کاتانەدا دەگوترێت کە ڕایەکی نەرێ لەسەر کارێك هەبێت و بەم شێوەیە (نەرێی نەرێ)ی پێ دەکرێت.

**١٣-اذا طلع موهيچي؟:**

(ئەگەر وانەبوو؟) بۆ زانینی دیوی دوەمی گریمان لە حاڵەتی یەکسان نەبوونی ووتراو لەگەڵ ئەنجام دراودا.

**١٤- يجوز ما يطلع هيچي!:**

(لەوانەیە وانەبێت) هەمان پێ زانینی حاڵەتی دیوی دووەمی گریمان و راسەبارەتی.

# ئاماژەو دەست نیشانکردن

کاتێك بێژەر بیەوێت ئاماژەو جغت بخاتە سەر کەس، شوێن یان شتێك، ئەوا دەکرێت لە ووشەی (اللی) (ئەوەی کە) بەکار ببات و بیخاتە سەر ئەوەی دەیەوێت ئاماژەی پێ بدات.

سەرەتا پێویست دەکات (اسم اشارە)ەکان دەست نیشان بکرێن:

| | |
|---|---|
| هذا | ئەمە (نێر) نزیك |
| های | ئەمە (مێ) نزیك |
| ذاك | ئەوە (نێر) دور |
| ذیچ | ئەوە (مێ) دور |
| هذولە : | ئەوانە (نێر) |
| هذنی | ئەوانە (مێ) |

## شێوەی پێکهێنانی:

| | |
|---|---|
| اسم اشارە + اللی + فعل | ئاماژە |
| هذا آللی گاعد. | ئەوەی کە دانیشتووە. |
| ذیچە آللی انکسر. | ئەوەی کە شکا. |
| هذولە اللی واگفین. | ئەوانەی کە ڕاوەستاون. |

## له كاتی........

هەندێك جار پێویست دەكات لە (كاتی) كردنی كارێك دا ڕوداوێك یان بوونی شتێك لەڕێی قسەوە دەربخرێت، ئەوا پێویست دەكات كەڵك لە پێشگرێكی سۆپیتی (بآل...) وەربگیرێت، بۆ ئەوەی (لەو دەمەدا)ی دەربخرێت:

گومانی تێدا نیە كە ئەو پێشگرە دەبێت بخرێتە سەر ئەو (فرمانە)ی كە دەویسترێت لە تەكیدا بەكار ببرێت:

پێشگری بآل + چاوگی فرمان

بآل + رجعه ---- بآلرجعه **لەكاتی گەڕانەوەدا**

بآل + جيّه --- بآلجيه **لەكاتی هاتنەوەدا**

بآلرجعه، ما اجه ويانا. **له گەڕانەوەدا، نەهات لەگەڵماندا.**

بآلجيه، نسه غراضه. **له هاتنەوەدا، شتەكانی لەبیر چوو.**

بآلصعده، طگ التايَر. **له هەورازەكەدا، تايەكە تەقی.**

بآلنزله، انگلّب. **له سەرەو لێژیەكەدا، وەرگەڕا.**

بآلروحه أخذه وياك. **له ڕۆیشتندا، لەگوڵ خۆتدا ببیه.**

ت١/ هەمان پێشگر هەندێك جار وەك ئامرازی (بە) بەكار دەبرێت:

## ت /٢/ نی موهسه:

دەستەواژەیە كە زیتر بۆ ئاماژەدان بە (كات)ی كردارەكەیە و زۆرجار وەك گلەیی و گازندەیش بەكاردەبرێت:

نی موهسه گتلك. ئاخر ئێستە پێم ووتیت.

نی مو میت مره گتلك. ئاخر سەدجار پێم وتی.

## به دڵ بوون، پەسەند کردن

ئەگەر کەسێك بیەوێت بە دڵ بوون و پەسەند بونی کەس یان شتێك دەربڕێت، ئەوا لەم ووشانە کەڵك وەردەگرێت:

| | |
|---|---|
| یلوگ | لێ هاتن |
| مایلوگ | لێ نەهاتن |
| یعجب | بەدڵ بوون |
| ما یعجب | بەدڵ نەبوون |
| جید | باشە |
| یلوگلك آلگصە! | ئەو تاشینەت لێ دێ! |
| ما یلوگلك آلقَمیص! | ئەو کراسەت لێ نایەت! |
| یعجبنی گولتە! | قسەکەیم بە دڵە! |
| ما یعجبنی حچایتە! | قسەکەیم بەدڵ نیە! |

ت/١/ دەکرێت ووشەی (حُب) یش بۆ پەسەند بوون بەکار ببرێت:

ما أحبە! خۆشم لێ نایەت! خۆشم ناوێت!

ما أحب هیچ سوالف! حەزم لەو جۆرە قسانە نیە!

ت/٢/ دەکرێت پێچەوانەی ووشەی (حُب) یش کە (کرُه)ە، بەکاربرێت:

اکره هیچ مشیە! رقم لە رۆیشتنی وایە!

# هەیە، نیە

بۆ ئەوەی (پرسیار) یان (وەڵام) لە بوونی شتێك بكرێت و، وەڵام بدرێتەوە، دەكرێت لەم ووشانە كەڵك وەربگرێت:

| | |
|---|---|
| أكو | هەیە |
| ماكو | نیە |
| عدنا | هەمانە |
| ماعدنا | نیمانە |
| لا | نا، نەخێر |
| نَعم | بەڵێ |
| بلی | بەڵێ |
| عدكم..؟ | هەتانە..؟ |

ت/ دەكرێت ئەو ووشانەی بۆ رێزو داوا بەكاردەبرێن، لەگەڵ (پرسیار كردن) وەیاخود (وەڵام دانەوە) دا بهێنرێن:

بَلا زحمَة! بێ زەحمەت ، ئەرك نەبێ

| | |
|---|---|
| عێنی | چاوەکەم |
| أخویە | براکەم |
| یوبە | باوکە |
| عُذراً | ببورە |
| أغاتی | بەرێزم ، ئازیزم |

بلا زحمە عدکُم معجون أسنان؟

بێ زەحمەت مەعجونی دانتان هەیە؟

| | |
|---|---|
| عینی ، هایە بێش؟ | چاوەکەم ئەمە بە چەندە؟ |
| إی ، عدنا معجون أسنان. | ئا مەعجونی دانمان هەیە. |
| لا عینی ماکو. | نەچاوەکەم نیە. |
| بلی ، عدنا. | بەڵێ هەمانە. |

# پێشکەش کردن

دەکرێت ئەو شتەی دەتەوێت پێشکەشی بکەیت، بە درێژ کردنی، وە یاخود لەکاتی دوان سەبارەتی، ئەو ووشانە وە یا دەستەواژانە بەکار ببەیت:

تسیتاهل ـــــ

تگبـل ـــــ

ما یغله علیك ـــــ

تگبل ـــــ

قمیص مالك، کلش حلو! کراسەکەت، زۆر جوانە!

تستاهله. پێشکەشت بێت.

تگبل. پێشکەشت بێت.

# سوپاس كردن

| | |
|---|---|
| شكراً. | سوپاس. |
| ألف شكر. | هەزار سوپاس (زۆر). |
| ممنون. | مەمنون. |
| عاش إيدك. | دەستت خۆش بێت. |
| الله يجازيك بالخير. | خوا بە باشی پاداشتت بداتەوە. |
| الله ينصرك. | خوا سەركەوتوت بكات. |
| آني هوايه أشكرك. | من زۆر سوپاست دەكەم. |
| أغاتي ألف شكر. | ئازیزم هەزار (زۆر) سوپاس. |
| تدلل. | نازت هەیە. |
| تسلم. | خۆش بیت (پارێزراو بیت). |
| آني بآلخدمة | لە خزمەتام. |

# پێویست و نا پێویست

بۆ ئەوەی پێویست بوون و پێویست نەبوون ئەوەی سەبارەتی قسە دەکرێت دەربخرێت، ئەوا دەکرێت لە ووشەکانی ( ضروری) و (مو ضروری) و هەروەها کەڵکیش لە ووشەی (لازم) و (مو لازم) وەربگیرێت:

| | |
|---|---|
| ضروری | پێویستە |
| مو ضروری | پێویست نیە |
| لازم | ئەبێت |
| مو لازم | نابێت |
| لازم تروح علیهم | پێویستە برۆیت بۆلایان |
| ضروری تشوفهم | پێویستە بیانبینیت |
| ما لازم تروح. | پێویست ناکات برۆیت |

# بە کەڵك - بێ کەڵك

بەوەی ئەمڕۆکە (کەڵك) بۆتە پێودانگەیەك و لە ڕێیەوە شتەکان و (باشە) و (خراپە)ی پێ دەپێورێت و تەنیا بوارێکی پێ کێش ناکرێت، زانینی ئەو ووشەیەی بۆ ئەو بوارە بەکار دەبرێت، کەڵکێکی بۆ خوێنەر دەبێت:

| | |
|---|---|
| مُفید | بە کەڵك |
| غیر مُفید | بێ سود |
| یفید | بە سود |
| ما یفید | بێ کەڵك |
| یفیدنی. | بە کەڵکم دێت. |
| ما یفیدنی. | بە کەڵکم نایەت. |
| یفیدك. | سودی لێ وەردەگریت. |
| ما یفیدك. | سودی بۆت نیە. |
| یفیدە. | کەڵکی لێ وەردەگرێت. |
| ما یفیدە. | کەڵکی لێ وەرناگرێت. |
| أستفاد منە. | سودی بۆم هەیە. |
| ما أستفاد منە. | بە کەڵکم نایەت. |
| های شنو؛ ما یفیدك. | ئەوە چیە؟ کەڵکی بۆت نیە. |
| شیفیدك؟ | بەکاری چیت دێت؟ |
| ما أصور یفیدك. | تەسەور ناکەم بە کەڵکت بێت. |
| أصور یفیدك. | وا بزانم بە کەڵکت دێت. |

# پلەکاری

کاتێك بێژەر بیەوێت باسی رووداوێك یا کردارێك بکات و زێتر بیەوێت (چۆنیەتی) کردارەکە دەربخات، دەکرێت لە هەرسێ ووشەی (ورە ما...) (بعد ما...) و (قبل ما...) کەڵك وەربگرێت و شێوەیەکی گێڕانەوەیی بە باسەکەی بدات. لەم ڕێیەوە (پلەکاری) روداو یان کارەکە دەردەخرێت:

| | |
|---|---|
| قبل ما تروح،... | پێش ئەوەی بڕۆیت... |
| *گبل ما تروح،...* | پێش ئەوەی بڕۆیت... |
| بعد ما تیجی.. | دوای ئەوەی هاتیتەوە.. |
| ورە ما تاکل.. | دوای ئەوەی نانت خوارد.. |
| گبل ما اشوفك.. | پێش ئەوەی بت بینم... |
| قبل ما تنام، | پێش ئەوەی بخەویت |

ت /١/ دەکرێت بە پێوە لکاندنی ئاوەڵفرمانێکی کاتی بۆسەر ڕستەکە، ئەو ڕستەیە دۆخێکی گێڕانەوەیی ورد لەگەڵ پلەبوونی کارەکان، دیاری بکرێت:

گبل ما تیجی بساعە..پێش ئەوەی بێیت بە سەعاتێك...

ورە مارحت بشویە... دوا تۆزێك لەوەی تۆ ڕۆیشتیت...

قبل لا تخابرنی بنص ساعە...

نیو سەعات بەر لەوەی تۆ تەلەفۆن بکەیت...

### ت /٢/ تونی:

ووشەی (تَونی) زێتر بۆ ڕوونکردنەوەو ئاماژەدان و جەغت کردنە سەر (کات)ی کردارەکەیە و جۆرێك لە پلە کاریش دەردەخات:

| | |
|---|---|
| تونی گاعَدْت. | ئێستە هەڵسام. |
| تونی جیت. | ئێستە هاتم. |

# باشه – خراپه

هەموو ئەو شت یان کردار یان قسانەی کە دەویسترێت ڕایەکیان لەسەر دەرببڕین و باشەو خراپەیان دیاری بکەین، ئەوا دەکرێت لە ووشەی (زێن)و (مو زێن) کەڵك وەربگرین:

| | |
|---|---|
| ***هاي زين.*** | ***ئەمە باشە.*** |
| هاي مو زين. | ئەمە باش نیە. |
| هذا زين. | ئەمە باشە. |
| هذا مو زين. | ئەمە باش نیە. |
| مو زين لا تسوي هيچی. | خراپە، ئاوا مەکە. |
| زين، سوي هيچی. | باشە، وا بکە. |
| هذا كليش زين. | ئەمە زۆر باشە. |
| هذا كليش مو زين. | ئەمە زۆر خراپە. |
| مو زين، لا تأكل هواية | زۆر مەخۆ، باش نیە. |

***الْعَبْ رياضة، كليش زين عليك.***

***وەرزش بکە، بۆت زۆر باشە.***

## بۆ لێچواندن

| | |
|---|---|
| چنّك... | ئەڵێی، هەروەك... |
| عبالك | ئەڵێی، هەروەك... |
| چنك ما تدری..؟! | ئەڵێی نازانی..؟! |
| چنە سكران؟! | ئەڵێی سەرخۆشە؟! |

ت/١/ هەنـدێك جـار ووشـەی (عبالـك) بـۆ (وا زانـین) بـەكار دەبرێت:

عبالی ما تجی. وام ئەزانی نایەیت.

ما ادری، عبالی بخمس دنانیر.

نەم زانی، وام ئەزانی بە پێنج دینارە.

عبالە ما شایف شی! ئەڵێی هیچی نەدیووە!

وام ئەزانی هیچی نەدیووە.

# بۆ دوور گرتن له ڕوو

چەند ئیدیۆمێك هەیە کەوا باوە لە کاتی ووتن وە یاخود کردنی کارێکدا ڕەچاو بکرێت - وەك ئەوەی لە کوردەواریدا لەکاتی ووتنی نەخۆشی و شتی پیس و ... دا دەوترێت- لای ئەوانیش هەمان شێوەیە. لە چەند باسێکدا ووشەی (تکرم) وەك دوور گرتنێکی بەرامبەر، بەکار دەبرێت:

ت /١/ بۆ سوێند خواردن بە خوا لەسەر شتێکی پیس، ئەوا بەم شێوەیە دەوترێت:

تكرم الله.

ت /٢/ لەکاتی وەستان لە سەرەی ئاودەستدا و لەکاتێکدا بویسترێت بە کەسێك وەك ڕێز بوترێت بۆ ئەوەی لە پێش تۆدا بچێتە سەرئاو، ئەوا تەنیا (تكرّم) ئەوترێت و بە هیچ شێوەیەك ووشەی (فەرموو) بەکار نابرێت.

ت /٣/ بەڵام لەکاتی قسەکردنداو کاتێك (باشی) و چاکی کەسێك لەبەردەم کەسێکدا باس دەکرێت، بۆ ئەوەی لەلای بەرامبەر ئەو تێگەیشتنە دروست نەبێت کە (گوێگر) خراپە، ئەوا ووشەی (لا خير عليك) کە هەروەك (ماڵی ئاوا بێت لەگەڵ تۆدا)و (لە ڕوی تۆدا نەبێ) ی کوردەواری وایە، بەکار دەبرێت.

# دان و وەگرتن و دانان

| | |
|---|---|
| هاك | بگرە ، هانێ |
| أخُذ | وەرگرە |
| ألزَم | بگرە ، بیگرە |
| جیب | بێنە |
| هاك | بێنە |
| ودی | ببیە |
| نزلە | دایگرە |
| حطە | داینێ |
| خلی | داینێ. وازی لێ بێنە |
| هاك هایە | ها ئەمە. |
| أخُذ هایە | ئەمە وەرگرە. |
| ألزم هایە | ئەمە بگرە. |
| مناك ألزمە | لەولاوە بیگرە |
| نزلە أهنە | لێرە دایگرە. |
| خلی أهناك | لەوێ داینێ. |

# پارەدان و پارە وەرگرتن

بەوەی (دان) (وەرگرتن) (ژماردن) (کۆ) و (سەرجەم) لەم بوارەدا ئەو ووشانەن کە بەکاردەبرێن، ئەمانە ئەو ووشانەن کە بەکاردەبرێن:

| | |
|---|---|
| دَفع | دان |
| أعطاء | دان |
| أخذ | وەرگرتن |
| حساب | ژماردن |
| مجموع | کۆ |
| کُل | هەموی |
| ژگد؟ | چەند؟ |
| یصیر | دەکاتە.. |
| اقل | کەمتر |
| أكثر | زیاتر |
| بیَش؟ | بەچەند؟ |
| ژگد أطیته؟ | چەندت دایە؟ |

ژگد تطي؟ چەند دەدەیت؟

ادفع خمسين دينار. پەنجا دينار بدە.

يصير أربع تالاف دينار.

دەكاتە چوار هەزار دينار.

انت ماخذ هوايه منى. تۆ زۆرت لێ سەندوم.

حسابكَ تصير عشرين الف.

حسابەكەت دەكاتە بيست هەزار.

ليش تأخُذ منه زايد؟ بۆ زياى لێ وەردەگريت؟

# به تەنیا (جگە کردن)

کاتێك بویسترێت وتنی کارێك وە یاخود کردنی کارێك (بە تەنیا)یشی دەربخرێت، ئەوا لە ووشەی (وحدي) یان (بس) کەڵك وەردەگیرێت:

| | |
|---|---|
| وحدي | بە تەنیایی |
| بس | تەنیا |
| فقط | بە تەنیا تەنیا! |
| بس هو أجه. | تەنها ئەو هات |
| وحده أجه. | بە تەنیا هات. |
| تعال وحدك. | بە تەنیا وەرە. |
| خلي يجي وحده. | با بە تەنیا بێت. |
| گوله خلي يجي وحده. | پێی بڵێ با بە تەنیا بێت. |
| راح يروح وحده. | بە تەنیا دەچێت. |
| أجه وحده، ما حدٌ ويه. | بە تەنیا هات، کەسی لەگەڵدا نیە. |

ت/ ووشەی (بس) دەکرێت بۆ (بێجگە) کردن و جیاکردنەوەش بە کارببرێت:

| | |
|---|---|
| بس گوله هيچي و ... | تەنیا وای پێ بڵێو..... |
| بس هاي............ | تەنیا ئەمە .......... |

## • پرسیار

پرسـیارەکانی مـرۆڤ زۆرن، بـەڵام دەکرێـت لـە چـوار جـۆر پرسیاری سەرەکیدا کۆبکرێنەوە:

١- پرسیار لە مرۆڤ.
٢- پرسیار لە شوێن.
٣- پرسیار لە کات.
٤- پرسیار لە شت.

لێرەدا، بە کورتی هەر چوار جۆرەکەی و شێوازو ووشەی پێویست لەبۆ پرسیارکردن سەربارەتیان، دەخەینە ڕوو:

### ١ پرسیار لە مرۆڤ:

ووشەی (منو) (کێ) دەکرێت لە بۆ پرسیارکردن لە کەسێك بەکار ببرێت بەڵام دەبێت ڕەچاوی ئەوە بکرێت کە:

جاری وەها هەیە بە تەنیایی بەکار دەبرێت، ئەویش گەر بیویسترێت بە کورتی و خێرایی بکرێت:

| | |
|---|---|
| منو؟ | کێ؟ |
| منو اجە؟ | کێ هات؟ |
| منو خابر؟ | کێ تەلەفۆنی کرد؟ |

جاری وەها هەیە لەگەڵ ئەو ووشەیەدا، وشەی (هو) یان (هی) بەکاردەبرێت:

منو هو؟ ئەوە کێیە؟ (بۆ نێر)

منو هی؟ ئەوە کێیە؟ (بۆ مێ)

## ٢- پرسيار له شوێن:

ووشـەی (مـێن) (وێـن) لـه بـۆ پرسـيارکردن لـه شـوێنێك بەکاردەبرێت:

وێن رايح؟ بۆ کوێ دەچيت؟

وێن تروح؟ بۆ کوێ دەچيت؟

وێن صاير علاوی حله؟

عەلاوی حله، له کوێ دايه (کەوتۆته کوێوه)؟

انت مێن؟ تۆ خەڵکی کوێيت؟

مێن جای؟ له کوێوه هاتووی؟

ت /١/ ووشەی (وێن صاير) لەو کاتانەدا بەکاردەبرێت کـه بيوسـترێت کەوتنـه شـوێنێکەوه بزانرێـت. واتـه بـۆ زانينی (ئەو شوێنه کەوتۆته کوێوه) بەکاردەبرێت

ت /٢/ جاری وەها هەیە کە ووشەی (وێنك) لە بۆ پێزانینی هۆی نادیار بوونی کەسێك بەکاردەبرێت:

وێنك؟ لە کوێیت؟

انتە وینك؟ تۆ لە کوێیت؟

ت /٣/ دەکرێت بە ووشەی (وێن)ەوە، ڕاناوە لکاوەکان بلکێنرێت:

وێنك؟ لە کوێیت؟

وینە؟ لە کوێیە؟

وێنهم؟ لە کوێن؟

ت /٤/ جاری وەها هەیە کە ووشەی (وێن صار) لە بۆ پرسیارکردن لە شوێنی کەسێك وەیاخود (گەیشتن بە کوێ) بەکاردەبرێت:

احمد وێن صار؟ ئەحمەد کەوتە کوێوە؟

**پرسیار لە کات:**

ووشەی (یمتە) (شوکت) بۆ پرسیارکردن لە کات بەکاردەبرێت:

یمتە نروح؟ کەی بڕۆین؟

یمتە راح؟ کەی ڕۆیشت؟

شوکت تسافر؟ کەی سەفەر ئەکەی؟

شوکت تنام؟ کەی دەخەویت؟

## ٣٤- پرسیار له شت:

ووشەی (شنو) بۆ پرسیارکردن له شت بەکاردەبرێت. بەڵام دەبێت ڕەچاوی ئەوە بکرێت کە چەشنی شتەکەی لە تەکدا بووترێت:

شنو های؟ ئەوە چیە؟

شنو شایل ویاك؟ ئەوە چیە لەگەڵ خۆتا هەڵت گرتووە؟

ت /١/ ووشەی (شبیك) لە بۆ (چۆن) بوون و پرسیارکردن لێی بەکاردەبرێت:

شبیك، مریض؟ چیتە، نەخۆشیت؟

شبیك، لیش ضایج؟ چیتە، بۆ بێزاریت؟

ت /٢/ ووشەی (شَکو) (چیە) بۆ (چی بوون) و ماهیەتی شتەکان و ڕوداوەکان بەکاردەبرێت:

شکو، شصایر. چیە، چی بووە؟

شکو، لیش گاعد؟ چیە، بۆ دانیشتوی؟

## پرسیار له ( کەڕەت ) ( جار ) (دانه ) ( چەند )

بۆ پرسیارکردن له کەڕەت و جار، ووشەی (چم مرّه) و (چم واحد) بەکاردەبرێت:

| | |
|---|---|
| مرّه ألالاخ | کەرەتێکی تر |
| چم مرّه ؟ | چەند کەڕەت (جار)؟ |
| چم واحد؟ | چەند دانه؟ |
| چم وحده؟ | چەند دانه (بۆ مێ) و (بێ گیان) |

ت /١/ دەکرێت ناوی ئەو شتەی که له دانەو کەڕەت و جارەکەی دەپرسرێت، لەگەڵ وشەی (چم) دا به مەبەستی وردتر بوون بەکاربرێت:

| | |
|---|---|
| چم قَلَم؟ | چەند قەڵەم؟ |
| چم کیس؟ | چەند کیس؟ |
| چم ساعه؟ | چەند سەعات؟ |
| چم مرّه رحت؟ | چەند جار ڕۆیشتیت؟ |
| چم کیلۆ؟ | چەند کیلۆ؟ |

مرّه آللاخ، لا تسوی هیچی. کەڕەتێکی تر وا نەکەیت.

ت /٢/ ووشەی (هه آلنوبه) یان (آلنوبه)ش، به واتای (ئەم کەرەته) یان (ئەم جاره) ش دێت و بۆ هەمان مەبەستیش بەکاردەبرێت.

# ووشەیەکی هاوبەش لە واتادا

ووشـەی (الله یـساعدك) دەکرێـت لـەم بوارانـەی خـوارەوەدا بەکارببرێت:

ت /١/ بـۆ سـڵاو کـردن (لـە کـاتی کارکردنـدا). بـە واتایـەکی دی، لەو کاتەدا کە دەتـەوێت سـڵاو لـە کەسـێك بکـەیت کـە (کـار دەکات)، باشتر وایە ئەو دەستەواژەیە بەکاربەریت کە بە واتـای (خوا قەوەتت بدات) دێت.

ت /٢/ کاتێك بتەوێت لەگەڵ کەسێکدا بدوێیت ئەو کەسـەش بەکارێکـەوە خـەریك بێـت. واتـە دەکرێـت وەك (دەسـتپێك) بـۆ قـسەکردن لەگـەڵ ئـەو کەسـەی لـەکاتی کارکردنیدایـە، بـەکاری ببەیت.

ت /٣/ بۆ دڵدانەوەو دڵخۆشی دانەوەی بەرامبەر. واتە کاتێك کەسـێك سـەبارەت بـە (مەینەتیـەکان) وەك ئیـشی زۆر، سەرقاڵبوونی زۆرو هـیلاك بـوون بـە پەیـداکردنی رزق و رۆزی و بـژێوی ڕۆژانـەوە، یـان بـاری قورسـی ژیـان و بـاری قورسـی دەرونـی و کۆسـت و... ئـەوا دەکرێـت وەك (هاوپـشتی) و (خەمخۆری) و (دڵنەوایی)... ئەو دەستەواژەیە بەکاربرێت.

الله یساعدك شلون تتحمَّل!

خوا یارمەتیت بدات کە چۆن دان بە خۆتا دەگری؟

# لە مەترسیدا

ئەمڕۆ زێتر (دڵە ڕاوکێکان) باڵی بەسەر جیهان بە گشتی و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا کێشاوە، ئەمە بۆتە هۆی ئەوەی (ترس) بێتە دەرئەنجامێکی هەرەدیار لەم ناوچەیەدا. لێرەوە زمان بە تایبەت (زاراوە گشتییەکان)، ئەو ووشانەی سیمای ترس و تۆقان دەگەیەنن، زۆر بە بڵاوی لە زاراوەکانی ئەم دەڤەرەدا دیارە. لێرەوەیە پێزانینی (ترسەکان) ڕێگایەك و شێوازێکی زۆر دیارو ئاشکرایە بۆ ناسینی مرۆڤەکان.

| | |
|---|---|
| خوف | ترس |
| أخاف | ئەترسم |
| تخاف | ئەترسیت |
| تخاف؟ | ئەترسیت؟ |
| يخاف | ئەترسێت |
| نخاف | ئەترسین |
| تخافون | ئەترسن (کەسی دووەمی کۆ) |
| يخافون | ئەترسن |

ت/ مرۆڤ لە هەر شتێك بترسێت وە یان نادڵیاو نائارام بێت، ئەوا ئەو ووشەیە لەگەڵ ئەو شتەدا بەکار دەبات.

أخاف من آلحیوانات. لە ئاژەڵان ئەترسم.

أخاف من آلحروب. ئەترسم لە شەڕ.

أخاف أتعارك. ئەترسم شەڕ بکەم.

تخاف تیجی؟ ئەترسی بێیت؟

یخاف ننگلب! ئەترسێت وەرگەڕێین!

أخاف یصیر هجوم علینا!

ئەترسم هێرشمان لەسەر بکرێت!.

أخاف یـچـذبون علینە؟!

ئەترسم لەگەڵماندا درۆ بکەن.

أخاف ما یصیر؟! ئەترسم نەبێت؟!

شنو تخاف ما نلحگ علیْهُم؟

چیە ئەترسی پێیان نەگەینەوە؟.

آني ما أخاف. من ناترسم.

علویش تخاف؟ بۆ ئەترسیت؟

## سوێند خواردن

بۆسوێند خواردن، دەكرێت بە هەموو ئەو كەس و شتانەی لای مرۆڤ پیرۆزە، سوێند بخورێت. وە هەرچەندە سوێند خواردن لە كەمی بڕواوە لەناو خەڵك و كۆمەڵاندا سەرچاوەی گرتووە، بەڵام لەلای زۆر لە كەسان و خەڵكان، وەك خونەریت و نیشانەی ڕاستگۆ بوون وەرگیراوە.

لە وڵاتانی ئیسلامدا، زیاتر سوێند بە خوداو كەسایەتیە پیرۆزەكانی ئایین دەخورێت. هەروەها كەس و كارو ئەو كەسە خۆشەویستانەی كە لای كەسی سوێند خۆر پیرۆزە:

| | |
|---|---|
| بألله | بەخوا |
| وعلی.. | بە (حەزرەتی) عەلی (سڵاوی خوای لێ بێت) |
| و الحسین.. | بە (حەزرەتی) حسێن (سڵاوی خوای لێ بێت) |
| بروح والدي.. | بە گیانی باوكم |
| وروح الوالده.. | بە گیانی دایكم... |

ت/ دەكرێت و باویشە بۆ ئەوەی لە سوێند خواردن دورە پەرێز بێت، وا باوە لە وشەی (صدگنی) و (ثق) كەڵك وەردەگرێت.

| | |
|---|---|
| صدگنی | باوەڕم پێ بكە. |
| ثق | باوەڕكە |

# هەڕەشەو گوڕەشە

هەرچەندە باشترین مرۆڤ هیچ کاتێك كەڵك لە (هەڕەشە)و ووشەكانی وەرناگرێت و بەردەوام ماوەی ئازادی مرۆڤ دەپارێزن، بەڵام دەكرێت ئەو ووشانە بزانرێت بە مەبەستی ئاگایار بوون لە جۆری مرۆڤی بەرامبەر نەك بە مەبەستی وەڵامدانەوەی بە هەڕەشەیەكی خراپتر. بەڵكو زمانی ئاخاوتن و تێ گەیاندن و لێكدانەوەو هێنانەوەی بەڵگە، باشترین شێوازی (لابردنی ئاڵۆزیەكان)ە. بۆیە بەكاربەرانی ئەم جۆرە ووشانە، بەڵگەی بوونی قەیران و مەترسی لەلایان دەردەخات!

| | |
|---|---|
| اكَسرَك | ئەتشكێنم |
| أكسر رَاسَك | سەرت ئەشكێنم |
| أكسر إيدَك | دەست ئەشكێنم |
| اقطع لسانَك | زمانت دەبڕم |
| اگـطَع رَاسك | سەرت دەبڕم. |
| اضْربَك | لێت دەدەم |
| اضربك راجدى | زللەیەكت لێ دەدەم |
| اضربك سچين | چەقۆیەكت لێ دەدەم |
| أضربك چلاق | شەقێكت تێ هەڵدەدەم |
| افشخَك | خوێنت لێ دەهێنم |

# گاڵتەو گەپ و سوبعەت

زۆر جار بۆ ئەوەی بەرامبەر بزانێت کە ئەو شتەی دەیڵێت وەیان (ئەنجامی دەدات) مەبەستی (خراپ)ی لێی نیە، بۆیە پێویست دەکات (وەیان) ناچار دەبێت بڵێت (بە سوعبەتم بوو).

لێرەدا دەکرێت ئەم ڕستانە بەکار ببرێت:

١- اشاقه وياك.     گاڵتەت لەگەڵدا دەکەم.

٢- ليش تشاقه     بۆ سوعبەت دەکەیت؟

٣- صُدُگ     بە ڕاست؟

٤- شبيك أشاقه وياك؟!

ئەوە چیتە گاڵتەت لەگەڵدا دەکەم؟

٥- لا تشاقه وياى؟!  سوعەبتم لەگەڵدا مەکە؟!

٦- لا تشاقه مو زين؟! سوعبەت مەکە باش نیە.

٧- أكبر منك، لا تشاقه ويه؟!

لە خۆت گەورەترە، لەگەڵیدا سوعبەت مەکە؟!

ت/ زۆر لەو ڕستانە بێ گومانە لەو کاتەدا کە شێوەی وەڵام دەگرێتەخۆ، بەڵام لە هەمان کاتیشدا پرسیارە لە بەرامبەریش لە پێویست دەکات وەڵاک بدرێتەوە.

بـۆ ڕسـتەی یەکـەمیان، دەکرێـت ئەمـە وەڵامەکـەی بێـت، ئـەویش ئەگـەر حـەز بـە سـوعەبت و گاڵتـەو گـەپ بکـات، ئـەوا دەکرێت بێ دەنگ بێت یان بوترێت:

آني ما أشاقه وياك.            من سوعبەت لەگەڵ تۆدا ناکەم.

بـۆ دووەمـین ڕسـتەش، ئـەکرێت وەڵامەکـەی پـشت بـەوە بەستێت کە:

أحبه على مود هاي أشاقه وياك.

خۆشم دەوێت بۆیە سوعبەتی لەگەڵدا دەکەم.

ویان ئەگەر بۆ (کات بەسەر بردن) بێت – کە لایـەنی خراپـی گاڵتەو گەپ پێك دەهێنێت – ئەوا:

لعد شلون نگضي الوقت؟!

ئەی چۆن (کاتە)کە بەسەر بەرین؟!

نريد نگضي الوقت؟!    دەمانەوێت کات بەسەر بەرین؟!

بۆ سێهەمین ڕستەش، خـۆی لـەو شـوێنانەدا دەوترێـت کـە قسەیەك بکرێت و نەزانرێت ڕاستە یان هەڵەیە یان بە سوعبەت دەوترێت. بۆیە هەندێك جار لە وەڵامیدا دەوترێت:

ما اشاقه　　　　به سوعبەت ناكەم.

شنو عبالك اشاقه وياك؟!

چيه وائەزانيت سوعبەتت لەگەڵدا ئەكەم؟.

شايف چذب منى؟!　　درۆت له من بينيوه؟!

قابل أچذب عليك؟!　　قابيله درۆت لەگەڵدا بكەم؟!

بۆ چوارەم ڕستەش، دەكرێت هەمان وەڵامی یەكەمین ڕستەی بۆ بەكار بهێنرێت.

بۆ پێنچەمین ڕستەش دەكرێت ئەو وەڵامە بدرێتەوە كە بەرامبەر پێی خۆشەو ڕازی دەكات:

زێن ما أشاقه وياك.　　باشه سوعبەتت لەگەڵدا ناكەم

یان دەكرێت (إذا ما تحب..) بۆ ڕستەی سەرەوە زیاد دەكرێت و بخرێته بەردەمی ڕستەكە.

بۆ ڕستەی شەشەمیش، لەبەر ئەوەی كە پرسیار لە (باشە)و (خراپە)ی گاڵتەوگەپە، دەكرێت پرسیار لە خراپەی بكرێت ئەویش بە مەبەستی پێزانینی (كاریگەری) یەكەی:

لێش موزين؟　　　بۆ خراپە؟!

لیش، تضوج من الشاقه؟　بۆ، به سوعبەت بێزار ئەبی؟!

# چەند خسڵەتێك

| | |
|---|---|
| حباب | خۆشەویست |
| خلوق | بە ئەخلاق |
| صبور | بە سەبر |
| حنون | بەسۆز |
| مُخلص | دڵسۆز |
| صادگ | ڕاستگۆ |
| عطوف | بە بەزەیی |
| طَیب | باش |
| صدیق | هاوڕێ |
| عَدو | دوژمن |
| چـذاب | درۆزن |
| غدار | غەدار |

هو کلش حَباب. ئەو زۆر خۆشەویستە.

چـذاب، لا تصدگه. درۆزنە، باوەڕی پێ مەکە.

# سلاو کردن

گومان لەوەدا نیە کە مەبەست لە سلاوکردن، دلنیاکردن و لابردنی ئالۆزی و گرژی و.. و هەموو ئەو هۆو هۆکارانەیە کە دەبنە هۆی دروستکردنی حالەتی (نە ئاشتی و نە شەڕ)، حالەتی (شەڕ)، دلنیا نەبوون و (دلە ڕاوکێ سازی) و بزواندنی حالەتەکانی گومان بە خراپە بردن..

لێرەوەیە لە (شێوەکانی سلاوکردن)دا، دەکرێت هەموو ئەو وشەو دەستەواژانەی کە ئەو حالەتە خراپانە لادەبەن، بەکاربرێن:

*** سلامٌ علَيْكُم:**

سەرەتای بینین و دەستپێکی هەر وشە و ڕستەیەك، هەمیشە بە (سلام علیکم) سلاوتان لێ بێت دەست پێ دەکات. لە ئەمەش خۆی دلنیادان بە بەرامبەرە کە (منی بێژەر) ئاشتیم بۆیەو دلنیابە (یان) بن کە حالەتی خراپم بە خۆم نەهێناوە. ئەمەش خۆی (مەبەست) لە سلاوکردنە.

* **شلونكم:**

ووشه (چۆنن) له دۆخی گوێگر (یان) گوێگران و (باشه) و (خراپه)ی ئەو دۆخه دەپرسێت:

ت /١/ دەكرێت (شلون) بەبێ (راناو) و بەم شێوانه بەكاربهێنرێت:

شلون الصحة؟ تەندروستی (ت، تان) چۆنه؟

شلون الاهل؟ كەس و كار چۆنن؟

ت /٢/ دەكرێت لەگەڵ كەس و كارو لە كاتی ئەحواڵ پرسیاندا، بەكاربرێت:

| | |
|---|---|
| بویه، شلونك؟ | باوه چۆنیت؟ |
| ابویه شلونك؟ | باوكه چۆنیت؟ |
| یومه شلونچ؟ | دایه چۆنیت؟ |
| اخی شلونك؟ | برام چۆنی؟ |
| شلونك خالی؟ | خاله چۆنیت؟ |
| شلونك عمی؟ | مامه چۆنیت؟ |
| ابن عمی شلونك؟ | ئامۆزا چۆنی؟ |

ت /٣/ دەكرێت به (ناو) سلاو له دۆخی گوێگر یان كەسێكی دیكه، بكرێت:

# کاتەکانی نان خواردن

ريوگ		نانی بەیانی

غدە		نانی نیوەڕۆ

عشە		نانی ئێوارە (شێوان)

أنت متريگ؟		تۆ نانی بەیانیت خواردووە؟

أي آني متريگ.		ئا ، من نانی بەیانیم خواردووە.

تغديت ويە أبو أحمد.

لەگەڵ ئەبو ئەحمەدا نانی نیوەڕۆم خوارد.

نروح نتعشە؟		بڕۆین نانی ئێوارە بخۆین؟

آني ماراح أتعشە.		من نانی ئێوارە ناخۆم.

راح نتغدە سمچ.		نیوەڕۆ ماسی دەخۆین.

شتحب نتريگ؟

حەز ئەکەی نانی بەیانی چی بخۆین؟

نتريگ گێمر.		نانی بەیانی قەیماغ دەخۆین.

# هـــاتـــن و ڕۆيـــشـــتـــن

## لەگەڵ - بەبێ

جيَّت وياهم        لەگەڵياندا هاتم

جيَّت وحدى        بە تەنيا هاتم

جيَّت ويە والدى        لەگەڵ باوكمدا هاتم

جيَّت ويە عائلتى        لەگەڵ خێزانەكەمدا هاتم.

أروح وياهم        لەگەڵياندا دەڕۆم.

أروح وحدى        بە تەنيا دەچم.

بَعد شويە أروح وياهم  تۆزێكى تر لەگەڵياندا دەچم.

رحت وياهم        لەگەڵياندا ڕۆيشتم.

رحت ويا إبن عمى        لەگەڵ كوڕى ماممدا چووم.

راح أروح وحدى        بە تەنيا دەچم.

راح اخذ زوجتى وياى  ژنەكەم لەگەڵ خۆمدا دەبەم.

| | |
|---|---|
| لا تروح وياهم | لەگەلياندا مەڕۆ |
| لا تيجي وياهم | لەگەڵياندا مەيە |
| اجه وحده | بە تەنيا هات |
| اجه وياهم | لەگەڵياندا هات |
| ليش اجيت وحَدك؟ | بۆ بە تەنيا هاتی؟ |
| ليش ما جبتهم وياك؟ | بۆ ئەوانيشت لەگەڵ خۆتا نەهێنا |
| راح يجي | (ئێستا) دێت |
| تيجي؟ | دێيت؟ |
| رحت ويه احمد؟ | لەگەڵ ئەحمەدا ڕۆيشتم |
| وێن رحت؟ | بۆ كویَ چويت؟ |
| مێن جيێت؟ | لە كویَوە هاتيت؟ |

گومان لەوەدا نیە کە سەرەڕای هات و چۆ، هەموو ئەو ەردارانەی لەکاتی هات و چۆدا ئەنجام دەدرێت، دەکرێت وەك ...و ڕستە) یان وەك پێشگرو پاشگر بە کرداری (هاتن)و ڕ...شتنەوە، ببەسترێتەوە. ئەویش ڕستەمان (وردتر) و جوانتر ...ات و زانیاری بە بەڕادەیەکی باش، دەدات بە دەستەوە.

| | |
|---|---|
| روحه | ڕۆیشتن |
| جیَه | هاتن |
| وطفة | وەستان |
| صعده | سەرکەوتن |
| نزله | دابەزین |
| إنتتظار | چاوەڕوانی |
| تعال | وەرە |
| رحت للسوط | چوم بۆ بازاڕ. |
| قبل شويه راح | تۆزێك لەمەوبەر ڕۆی. |
| بعد شويه | نروح   تۆزێکی تر دەڕۆین. |
| أروح | دەڕۆم. |
| أروح وياك | لەگەڵتا دەڕۆم (دێم لە گەڵتا). |
| لا تروح | مەڕۆ. |

إذا تريد، نروح   ئەگەر دەتەوێت، دەچین (دەڕۆین)؟.

آني شعليه، يرحون ما يرحون؟

من حەقم چییە، ئەڕۆن ناڕۆن؟

علويش أروح؟ بۆ بڕۆین؟ بۆ بچم؟

أخاف أروح؟ ئەترسم بچم؟

دروح وياهم؟ دە بچۆ لەگەڵیان؟

مو اطولك روح؟ پێت دەڵێم، بڕۆ؟

ليش تعاند دروح؟ بۆ عینادی دەکەیت دە بڕۆ؟

بلا زحمة شويه روح ليغاد؟

بێ زەحمەت کەمێك بڕۆ بەولاوە؟

آني وياك راح أروح؟ من لەگەڵ تۆدا دەڕۆم.

تيجي ويانا،لو تروح وياهم؟

لەگەڵ ئێمەدا دێیت، یان لەگەڵ ئەواندا دەڕۆیت؟

اجي. دێم.

اجي وياكم. لەگەڵتاندا دێم.

ویا أخویه راح أجی.          لەگەڵ براکەمدا دێم.

أنتظر شویه، راح أجی          کەمێك چاوەڕوان بکە، وا دێم

الصبح جیتکم          بەیانیەکەی هاتم بۆلاتان.

بعد شویه راح یجی          تۆزێکی تر دێت.

هسه تعال          ئێستا وەرە.

بسرعه تعال          خێرا وەرە.

ویاهم تعال          لەگەڵیاندا وەرە.

تعال أهنایه          وەرە ئێرە.

جیب آلغراض وتعال.          شتەکان بێنە وەرە.

انزل أهناك وتعال          لەوێ دابەزە وەرە.

لمّه تیجی، لا تروح علیهُم و رأساً تعالکاتێك دێیت، مەڕۆ بۆ لایان و یەکسەر وەرە.

بالروحه تعال علَیه          کاتێك ڕۆیشت وەرە بە دوامدا

# سەرکەوتن و دابەزین

بۆ ئەوەی بە وردی بتوانین گوزارشت لەو دوو کارە بدەین، دەکرێت چەند ووشەیەك بەکاربەرین. بەڵام زۆر جار بە مەبەستی گێرانەوەی)ی وێنەو (دروستکردن)ی وێنەی خوازراو لەلای سەر. هەوڵ دەدرێت لەگەڵ ئەو ووشانەدا (بەسەرچی)و لەچی)یەکەشی بووترێت. بە واتایەکی دی، (سوار)ی چی بوو؟ بەسەر چیدا) سەرکەوت؟ (لەچی) دابەزی؟و...دەدەخرێت.

| | |
|---|---|
| صعده | سەرکەوتن، هەوراز |
| نزلة | سەرەو لێژ، دابەزین |
| رکوب | سەرکەوتن |
| صَعدت بآلسيارە | سواری سەیارە بووم. |
| نزلت من آلسيارە | لە سەیارەکە دابەزیم. |
| اصعد | سەرئەکەوم. |
| انزل | دائەبەزم. |
| ننزل؟ | دائەبەزی؟ |
| راح أصعد | ئێستا سەرئەکەوم (سوار دەبم). |

| | |
|---|---|
| راح أنزل | ئێستا دائەبەزم. |
| راح أصعد الجبلْ | ئێستا بەسەر شاخەکەدا سەرئەکەوم. |
| راح أنزل من ألجبلْ | ئێستا لەسەر شاخەکەوە دێمە خوارێ. |
| نزلت من السطح | لەسەربان هاتمە خوارێ. |
| صعدت عالسطح | چوومە سەربان. |
| بألصعدة | لە کاتی سەرکەوتن (دابەزین)دا |
| بآلنزلة | لە کاتی دابەزین (سەرەولێژی)دا |
| نازل. | دائەبەزم. |
| صاعد. | سەر ئەکەوم. |
| نازل عندك. | لێرە دابەزینت هەیە. |
| عندك نازل. | لێرە دابەزینت هەیە. |
| صْعَد | سەرکەوت، چووە سەرەوە. |
| نزَل | دابەزی، چووە خوارەوە. |
| صْعدْ لیفۆگ | چووە سەرەوە. |
| نزَل جوه | چووە خوارەوە. |
| نزل من آلسیارە. | لە سەیارەکە دابەزی. |

ت/ بۆ چوونە سەر مانگ، لە ووشەی (وصل) کەڵك وەردەگیرێت.

وصلوا آلگُمر گەیشتنە مانگ.

# کردنەوەو داخستن

| | |
|---|---|
| اِدْفَع آلباب. | پاڵ بە دەرگاگەوە بنێ. |
| اِفتَح آلباب. | درگاگە بکەرەوە. |
| اِسحبْ آلباب. | درگاگە ڕاکێشە. |
| سُدّ آلباب. | درگاگە دابخە. |
| اِقفل آلباب. | درگاگە دابخە (بە کلیل). |
| لا تفتح آلباب. | درگاگە مەکەرەوە. |
| لا تسدُّ آلباب. | درگاگە دامەخە. |
| خلی آلباب مفتوح. | با درگاکە کراوە بێت. |
| سُدّ آلباب وراك. | چویتە دەرەوە درگاکە دابخە. |
| سده وراك. | دوای خۆت دایبخە. |
| دفتحه. | دەبیکەرەوە. |
| دسدّه. | دە دای بخە. |

## له ئۆتۆمۆبێلدا

هەندێك ووشەو زاراوەو دەستەواژە هەیە كە بۆ (نێو) ماشێن و سەیارە، وە یاخود دەرەوەیدا بەكار دەبرێت.

| | |
|---|---|
| جيّت بألسياره. | بە سەیارە هاتم. |
| بآلسيارة أروح. | بە سەیارە دەڕۆم. |
| راح أسافر بالسياره. | بە سەیارە سەفەر ئەكەم. |
| صعدت بآلسياره. | سواری (سەیارە) بووم. |
| راح أصعد بآلسياره. | سواری سەیارە دەبم. |
| هسه راح يطلع السياره. | ئێستا سەیارەكە دەڕوات. |
| طلعن آلسيارات. | سەیارەكان ڕۆیشتن. |
| ما چان أكو سيارات. | سەیارە نەبوو. |
| نزل من آلسياره. | لە سەیارەكە دابەزی. |
| أرجع شويه. | تۆزێ (وەرە) دواوە. |
| أُگف. | بۆستە. |
| أطلع. | دەرچۆ ، بڕۆ. |
| روح. | دەرچۆ ، بڕۆ. |
| تعال. | وەرە. |

| | |
|---|---|
| أرجع لوره | وەرە دواوە. |
| اطلع ليگدام | بڕۆ پێشەوە. |
| تحرك | بجولێ، بڕۆ. |
| أمشى | بڕۆ، دەرچۆ. |
| خلي يصعدْ | با سەرکەوێت. |
| خلي ينزل | با دابەزێت. |
| خلي يطلع | با بڕوات. |
| أگف أهنه | لێرەدا بوەستە. |
| أمشى منه | لێرەوە بڕۆ. |
| لوف | پێچ کەرەوە. |
| لوف منايه | لێرەوە پێچ کەرەوە. |
| دێور | پێچ کەرەوە |
| گربالك | ئاگاداربە |
| دربالك | ئاگاداربە، وریابە |
| لا تطلع | دەرمەچۆ، مەڕۆ |
| لا توگف | مەوەستە |
| لا تبيَت | لێرە ڕای مەگرە |
| لا تنزل | دامەبەزە |

| | |
|---|---|
| لا ديور | پێچ مەکەردوە |
| لا تلوف | پێچ مەکەرەوە |
| لا تمشی | مەڕۆ، دەرمەچۆ |
| لا تصعَدْ | سەرمەکەوە |
| لا توگف | مەوەستە |
| لا ترجع | مەیەرە دواوە |
| لا تدفع | پاڵ مەنێ |
| أدفع | پاڵ بنێ |
| ادفع شويه | تۆزێ پاڵنێ |
| جُر | ڕای کێشە |
| جُره لوره | رایکێشە بۆ دواوە |
| گدام | پێشەوە |
| گدامك سياره | سەیارەیەکت لە پێشەوەیە |
| گدامك نازل | لە پێشەوە دادەبەزم |
| سره | سەرە |
| أگف بآلسره | بەسەرە بوەستە |
| سيطره | سەیتەرە، خاڵی پشکنین |
| سيطره گدامك | سەیتەرەت لەبەرە |

| | |
|---|---|
| وراك سياره | له دواتەوە سەیارە هەیە |
| بصفك سياره | له تەنیشتەوە سەیارە هەیە |
| ديربالك لوره | ئاگات له دواوە بێت |
| شغلْ آلسيارة | سەیارەکەت ئیش پێ بکە (سلف لێدە) |
| شغل | بیخەرە ئیش |
| بدل | بیگۆڕە |
| بدل آلگير | گێڕەکە بگۆڕە |
| أكسر | بیشکێنەرەوە |
| أكسر عالمينه | بەلای ڕاستدا بیشکێنەرەوە |
| أكسر عالسيره | بەلای چەپدا بیشکێنەرەوە |
| لا تكسر عليه | مەیشکێنەرەوە سەری |
| ألزم | بیگرە |
| آلزم بريك | ئیستۆپ بگرە |
| لا تلزم بريك | ئیستۆپ مەگرە |
| كشن | کوشن |
| أگعد | دانیشە |
| اگعد عالكشن | لەسەر کوشنەکە دانیشە |
| نظف الكشن | کوشنەکە پاك بکەرەوە |

| | |
|---|---|
| داشبول | داشبلّ |

لا تخلی رجللك عالداشبول

قاچ مەخەرە سەر داشبڵەکە

| | |
|---|---|
| جامه | جامە |
| صعد الجامه | جامەکە هەڵبەرەوە (سەرنجە) |
| نزل الجامه | جامەکە بێنە خوارەوە |
| أگعد لوره | لە دواوە دانیشە |
| صدر | پێشەوە |
| أكعد بالصدر | لە پێشەوە دانیشە |
| نَفَر | نەفەر |
| چم نَفر؟ | چەند نەفەر؟ |
| نَفرات هوایه | نەفەری زۆر |
| مرایه | ئاوێنە |
| ستێرن | سوکان |
| تایر | تایە |
| لایت | لایت |
| ضوه | ڕوناکی |
| بگ لایت | لایتی دواوە |

| | |
|---|---|
| ناصى | (لايتى) نزم |
| عالي | (لايتى فول) |
| سكن | لايتى سەكن |
| سائق | شوفێر |
| دعاميه | دەعامى |
| شاصى | شاسى |
| ماكنه | مەكينه |
| گصه بگصه | ڕوبەڕو. جامه به جامه |
| ضربه | لێدان |
| گلبه | وەرگەڕان |
| انگلب | وەرگەڕا |
| طخه | بەركەوتن، لێدان |
| اصطدام | دەعم كردن |
| قاماره | قەمەره |
| سيارة تاكسى | سەيارەى كرێ |
| سيارة حمل | سەيارەى بار |
| سيارة ثمانتعش راكب(نفر) | هەژدە نەفەرى |

## بۆ میوانداری

| | |
|---|---|
| خطار | میوان |
| گرایب | خزم |
| جاینه خطار | میوانمان هەیە (هاتووە). |
| عدنه خطار | میوانمان هەیە. |
| چم واحد؟ | چەند کەسن؟ |
| منو همه؟ | کێن؟ |
| بێت عمامی | ماڵی مامەکانم. |
| بیت خوالی | ماڵی خاڵەکانم |
| رضیعتی | خوشکەکەم |
| گرایبنه | ناسیاومان |
| گرایبی | خزمم |
| گرابة اهلی | خزمی خێزانم |
| گرابة زوجتی | خزمی خێزانم |
| والدی | باوکم |
| والدتی | دایکم |
| أخویه | برام |
| أبویه | باوکم |
| عمی | مامم |
| عمتی | مامۆژنم |
| خالی | خاڵم |
| خالتی | پورم |
| إبن عمی | کوڕی مامم |
| بنت عمی | کچی مامم |

# له چاخانه‌دا

| | |
|---|---|
| مقهى | قاوه‌خانه ، چایخانه |
| چایخانه | چایخانه |
| صب | تێ کردن |
| سخين | پڕ ڕه‌نگ |
| خفيف | که‌م ره‌نگ |
| دشلمه | دیشله‌مه |
| حلو | شیرین |
| شَكر | شه‌کر |
| چای | چا |
| استكان | پیاڵه |
| صَحن | ژێر پیاڵه |
| قوری | قۆری |
| كتلى | کتری |
| نفاضه | ته‌پڵه‌کی جگه‌ره |
| طبله | ته‌پڵه‌ك |
| دۆمنه | دۆمینه |
| طاولى | تاوڵه |

| | |
|---|---|
| شطرنج | شەترەنج |
| كرسی | كورسی |
| بارد | ساردی |
| بارد | سارد |
| حار | گەرم |
| مسح | پاك كردنەوە |
| اطينا فد تلاث چايات؟ | سێ چامان بەرێ؟ |
| فد چای؟ | یەك چا؟ |
| خدر آلچای؟ | چاکە لێنێ؟ |
| صُب آلچای؟ | چاکە تێکە؟ |
| ليش ما تُصبَنا آلچای؟ | بۆ چاکەمان بۆ تێ ناکەی؟ |
| موگلنالك فد چای؟ | پێمان وتی چایەك؟ |
| أغاتی فَد چای؟ | ئازیزم چایەك؟ |
| ما جابلكُم آلچای؟ | چاکەی بۆ نەهێنان؟ |
| ردنا چاێین؟! | دوو چامان ویست؟! |
| فَد گلاس مای بلا زحمة؟! | پەرداخێك ئاو بێ زەحمەت؟! |
| عدكُم گهوە؟ | قاوەتان هەیە؟ |

## لەلای وویّنەگر

| | |
|---|---|
| صوره | وویّنه |
| گص | گرتن |
| صوره عائليه | وویّنەی خیّزانی |
| صورة جَماعية | وویّنەی بە کۆمەڵ |
| صوره عاديه | وویّنەی ئاسایی |
| صوره جوازات | وویّنەی پاسپۆرت |
| صور معاملات | وویّنەی مەعامەلات |
| صوره اسود وابيض | وویّنەی ڕەش و سپی |
| صوره ملونه | وویّنەی ڕەنگاو ڕەنگ |
| صور سريعه | وویّنەی خیّرا |
| صور كهربائيه | وویّنەی کارەبایی |
| صور بالكمپيوتر | وویّنە بە کۆمپیوتەر |
| سالب | نەگەتیڤ |
| موجب | پۆزەتیڤ |
| فلاش | فلاش |
| كاميرا | کامیّرا |

| | |
|---|---|
| جامه | جام |
| غسل | شتنەوە |
| طَبع | چاپ کردن |
| أريد أگص صوره؟ | ئەمەوێت رەسم بگرم؟ |
| أريد صوره لجواز سَفر؟ | وێنەیەکم بۆ پاسپۆرت ئەوێ؟ |
| عدكُم صور سريعه؟ | وێنەی خێراتان هەیە؟ |

## لەسەر تاشخانەدا

گومان لەوەدا نیە کە (چەشن)ی تاشین، هەر ماوەیەك و چەشنێکی تایبەت بەو ماوەیەو کاتە لە ئارا دەبێت کە (ناوی تایبەتی) خۆی دەبێت. بۆیە ئەوەی لێرەدا مەبەستە چەشنی تاشینەکان نیە، بەڵکو ئەو ووشانەیە کە گۆڕاناکاریان بەسەردا نەهاتووە بنەماین لەو بوارەدا.

| | |
|---|---|
| زیان | تاشین |
| گص | بڕین ، تاشین |
| زیان آللحیە | تاشینی ریش |
| زیان الشعر | تاشینی قژ |
| أرید أزَین لحیتی؟! | ئەمەوێت ریشم بتاشم؟! |
| أرید أگص شَعری؟! | ئەمەوێت قژم بتاشم؟! |
| شلون ترید اگص شَعرك؟ | ئەتەوێت چۆن قژت بتاشم؟ |
| شلون گصە ترید؟ | چۆن ئەتەوێت بۆت بتاشم؟ |
| مالایگلك آلزیان؟! | تاشینەکەت لێ نایەت؟! |
| یعجبك هیچی؟ | ئاوا حەزت لێیە؟ |

لاتگصره هوايه؟!　　　زۆر كورتی مەكەرەوە؟!

اگصره؟　　　كورتی بكەمەوە؟!

نگعه شويه؟　　　تۆزێك تەڕی بكە؟

شويه أطوَل من هايه؟!　تۆزێ لەمە درێژتر؟!

گصه عاديه!　　　تاشینێكی ئاسایی!

## بۆ کڕین و فرۆشتن

| | |
|---|---|
| (شره) | کڕین |
| بیع | فرۆشتن |
| رهن | ڕەهن |
| إیجار | کرێ |
| بێش؟ | به چەند |
| بشگد؟ | به چەند؟ |
| چم؟ | چەند؟ |

أرید أشتری کلیو طماطه — ئەمەوێن کیلۆیەك تەماته بکڕم

- بێش الکیلۆ؟ — کیلۆی به چەند؟
- چم کیلو ترید؟ — چەند کیلۆت ئەوێت؟
- فد کیلو — کیلۆیەك
- أرید فد کیلو — کیلۆیەکم ئەوێت.

ت /١/ بۆ وویستن، ووشەی (أرید) دەمەوێت بەکاردەهێنرێت.

ئەو کیلۆ (یان) ئەو بڕەی دەتەوێت، بیڵێیت.

أرید کیلۆێن پتتێته. دوو کیلۆ پەتاتەم دەوێت

ت /٢/ دەكرێت واز لەو ووشەیەش بهێنرێت و تەنیا ژمارەی ئەو كیلۆ (یان) ئەو بڕەی دەتەوێت، بیلێیت.

ت /٣/ بۆ زانینی نرخی هەر شتێك، دەكرێت ووشەی (بێش) بەكارببرێت. وە یان (بشگد) بە چەند بەكار بهێنرێت.

| | |
|---|---|
| بێش های؟ | ئەمە بە چەند؟ |
| بشگد؟ | بە چەند؟ |

ت /٤/ بۆ هەر پێویستیەك كە (دانە)ی بۆ بوكاربهێنرێت، ئەوا دەكرێت ووشەی (فد) بەكارببرێت.

| | |
|---|---|
| فد كێلۆ؟ | یەك كیلۆ |

ت /٥/ ئەو شتانەی (بە دانە) بفرۆشرێت، ئەوا دەكرێت لەكاتی ویستی پێزانینی نرخی (یەك دانە) ئەم ڕستەیە بەكار بهێنرێت:

| | |
|---|---|
| بێش آلوحدە؟ | دانەی بە چەند؟ |

ت /٦/ بۆ وەڵام دانەوەی ژمارەی ویستراو لەو شتەی دەتەوێت بیكرێت، دەكرێت بەم شێوانە وەڵام بدرێتەوە:

| | |
|---|---|
| فد كیلۆ. | یەك كیلۆ |

* وەیاخود ئەو چەند کیلۆیەی دەتەوێت، بە وتنی ژمارەی کیلۆی ویستراو دەوترێت:

| | |
|---|---|
| فد خمس کیلۆات. | پێنچ کیلۆ. |

* وەیاخو ئەگەر بە دانە بوو، بێجگە لەو وەڵامەی کە تەنیا ژمارەکەی دەوترێت، دەکرێت بە ووتنی ناوی شتەکە لەگەڵ ژمارەکەی بووترێت:

| | |
|---|---|
| فد جگارتێن. | دوو جگەرە. |
| فد شخاطە | شقارتەیەك (یەك دانە) |
| فد شویە | تۆزێکی تر |

# جل و بەرگ

| | |
|---|---|
| ملابس | جل و بەرگ |
| ملابس رجاليه | جل و بەرگی پیاوان |
| ملابس نسائیه | جل و بەرگی ژنان |
| چاکێت | چاکەت |
| پـنطرون | پانتۆڵ |
| قمیص | کراس |
| فانیله | فانیله |
| شورت | شۆرت |
| لباس | شۆرت |
| قمصله | قەمسەڵە |
| عبایه | عەبا (پیاوان و ژنان) |
| دشداشه | دزداشه |
| یشماخ | یەشماخ (جامانه) |
| حزام | پشتوێن |
| عگال | عەگاڵ |
| حدریه | کڵاو |

| | |
|---|---|
| دگمه | قۆپچه |
| مزروف | کون |
| مشگوگ | دڕاو |
| مخیّط | دوراو |
| خیاطه | دورین |
| اتُی | ئوتو |
| کوی | ئوتو کردن |

# بۆ تاقیکردنەوەی جل و بەرگ و پێڵاو

| | |
|---|---|
| يصير | ئەبێت |
| ما يصير | نابێت |
| حجم چبير | قەبارەی گەورە |
| حجم صغيّر | قەبارەی بچوك |
| ضَيّگ | تەسك |
| لون | رەنگ |
| فاتح | كراوە |
| طوخ | تۆخ |
| ملابس | جل و بەرگ |
| أحذيه | پێڵاو |
| تك | تاك (بۆ پێڵاو) |
| زوج | جوت |
| قياس | قياس |
| رقَم | ژمارە |

عدكُم قَميص عَليه؟

كراستان بۆمن (پڕ بە بەری من) هەيە؟

ما عدكم چاكيت شويه أكبر من هايه؟

چاكەتێكتان لەمە گەورەتر لایە؟

هایه شويه ضيّگ عليّه. ئەمە تۆزێ بۆم تەسكە.

ما يصير عليَه. بۆمن نابێت.

يصير عليّك؟ بۆت دەبێت؟

عدكم قياس ٤٢؟ قیاسی ٤٢ تان هەیە؟

أريد أكبر من هاى؟ لەمە گەورەترم دەوێت؟

# ناوی قۆناغەکانی تەمەنی مرۆڤ

| | |
|---|---|
| انسان | مرۆڤ (نێر) |
| انسانة | مرۆڤ (مێ) |
| طفل | منداڵ (نێر) |
| طفلة | منداڵ (مێ) |
| طفل رضيع | ساوا |
| جاهل | منداڵ (نەزان) |
| وليد | منداڵ |
| صغيرونی | بچکۆلانە |
| صغير | بچوك |
| شاب | گەنج، لاو |
| شابة | گەنج (مێ) |
| مرية | ژنێك |
| زلمه | پیاو (زەلام) |
| رجال | پیاوان |
| نسوان | ژنان |
| حُرمة | ژن |
| رجل چبير | پیاوێکی بە تەمەن |
| شايب | پیر |
| عجوز | پیر |

| | |
|---|---|
| عجوزه | پیره ژن |
| چبیر | گەورە، بەتەمەن |
| زوج | مێرد |
| زوجه | هاوسەر |
| أب | باوك |
| إبن | کوڕ |
| إبنه | کچ |
| بنت | کچ |
| أخ | برا |
| أخت | خوشك |
| رَضیعه | خوشك |
| عم | مام |
| عمه | پور |
| خال | خاڵ |
| خالة | پور |
| إبن العم | کوڕی مام |
| بنت العم | کچی مام |
| إبن خاله | کوڕی پور |
| بنت خاله | کچی پور |
| گرایب | ناسیاو، خزم |

| | |
|---|---|
| نسيب | خەزوور |
| فد واحد | کەسێك، زەلامێك |
| فد وحدة | کەسێك (بۆمێ) |
| چم جاهل عندك؟ | چەند منالّت هەیە؟ |
| هسه هو شاب! | ئیستا ئەو گەنجە (گەورە بووە) |
| **جه علێك فد رجل شايب.** | **پیاوێکی پیر هات بۆلات.** |
| زلمه وگدهه! | پیاویت و لە ئاستیایت. |

## ئەندامەکانی جەستە

| | |
|---|---|
| شعر | قژ |
| گصه | نێوچەوان |
| حاجب | برۆ |
| رموش | برژانگ |
| عين | چاو |
| خشم | لوت |
| أذن | گوێچکە |
| لحية | ڕیش |
| وجه | دەم وچاو |
| حلگ | دەم |
| لسان | زمان |
| سنون | دانەکان |
| فك | پوك |
| شارب | سمێڵ |
| حنچ | چەناگە |
| خد | ڕومەت |

| | |
|---|---|
| چتف | شان |
| صدر | سنگ |
| ذراع | قۆڵ |
| إيد | دەست |
| صرَة | ناوك |
| ظهر | پشت |
| فقرات | بڕبڕە |
| مثانة | میزەڵدان |
| زرور | ڕان |
| ركبة | ئەژنۆ |
| رجل | پێ، قاچ |
| أصبع | پەنجە |
| أصبع آليد | پەنجەی دەست |
| أصبع الرجل | پەنجەی دەست |
| أظافر | نینۆك |
| كف | لەپ |
| بلعوم | قوڕگ |
| شعرك طويل. | قژت درێژە. |
| عينك حلو. | چاوت جوانە. |
| ليش ما تشلعْ سنك؟ | بۆ دانت دەرناهێنێت؟ |
| مد رجلك. | قاچت درێژ بكە. |

# هەناو، ئازارو نەخۆشیەکان

| | |
|---|---|
| ضغط | فشار |
| وجع | ئازار |
| ورم | ئاوسان |
| جرح | برین |
| حساسیە | حەساسیەت |
| مَرَض | نەخۆشی |
| نَزیف | خوێنڕێژی |
| سکتە | سەکتە |
| کَسر | شکان |
| فُسخ | لەجێ چوون |
| إنسداد | بەستران |
| غازات | غازات |
| مغص | ترشەڵۆك بوون |
| لوی | پێچ |
| مصران أعور | ڕیخۆڵە کوێرە |
| حـــب | زیپکە |

| | |
|---|---|
| دوخه | سەر گێژە |
| زوعه | رشانەوە |
| گحه | کۆکە |
| ألتهاب | ئیلتاهب |
| سخونه | تـــا |
| نشله | هەڵامەت |
| مشی | چوون |
| عندك وجع | ئازارت هەیە؟ |
| عینك متورم | چاوت ئاوساوە |

عندك حساسیه بألابره؟

حەساسیەتت بە دەرزی لێدان هەیە؟

| | |
|---|---|
| شنو المرض مالك؟ | نەخۆشیەکەت چیە؟ |
| عنده نزیف داخلي | نەزیفی ناوەکی هەیە |
| ضاربه سکته | سەکتە ایٚی داوە |
| رجلي مفسوخ | قاچم لەجێ چووە |
| أزوع | ئەڕشێمەوە |

| | |
|---|---|
| أكح | ئەکۆکم |
| عنده سخونه | تای هەیە |
| شنو؟ منشول؟ | چییە؟ هەڵامەتتە؟ |
| عندي نشله | هەڵامەتم گرتووە |
| بطني تمشي | سکم دەچێت |
| راسي توجعني | سەرم دێشێت |
| راسي دايخ | سەرم گێژ دەخوات |
| كليش ادوخ | زۆر گێژ دە |

# له ماڵدا

| | |
|---|---|
| بيت | ماڵ ــ بينا |
| بيت چبير | ماڵی گەورە |
| بيت صغير | ماڵی بچوك |
| بيت إيجار | ماڵی كرێ |
| طابق | نهۆم |
| طابق الارضي | نهۆمی ژێرەوە |
| طابق الرابع | نهۆمی چوارەم |
| حوش | حەوشە |
| درج | قادرمە |
| غرفة | ژور |
| غرفة چبيره | ژوری گەورە |
| غرفة نوم | ژوری نوستن |
| غرفة آلضيوف | ژوری میوان |
| غرفة اضافية | ژوری زیایە |
| غرفة مگفوله | ژوری داخراو |
| مغسلة | دەست شۆری |
| حمام | حەمام |
| تواليت | ئاودەست |
| مرافق | ئاودەست |

# هەندێك كەل و پەلی ناوماڵ

| | |
|---|---|
| تلفزيون | تەلەفیزۆن |
| راديو | رادیۆ |
| مُسجل | تەسجیل |
| كرسي | كورسی |
| طاولة | مێز |
| سجادة | فەرش |
| مزهرية | گوڵدان |
| ابرة | دەرزی |
| خيط | دەزوو |
| ماعون | قاپ |
| طاسة | قاپی گەورە |
| دولكة | دۆلكە |
| صحن | ژێر پیاڵە |
| استكان | پیاڵە |
| خاشوگە | كەوچك |
| خاشوگە چاى | كەوچكە چا |
| خاشوگە اكل | كەوچكی چێشت |
| چتال | چەتاڵ |
| سچین | چەقۆ |
| جدريە | منجەڵ |
| صينيە | سینی |

| | |
|---|---|
| سٰفره | سفره |
| طبلة | تەپڵەك |
| نفاضة | تەپڵەکی جگەرە |
| لحاف | لێفە |
| مخده | سەرین |
| دوشك | دۆشەك |
| اوتي | ئوتو |
| مگص | مەقەست |
| ماكنة | مەكینە |
| ماكنة خياطة | مەكینەی خەیاتی |
| ماكنة زيان | مەكینەی ڕیش و قژ تاشین |

## ناو فێرگەو کەل و پەلی فێرگە

| | |
|---|---|
| مدرسة | قوتابخانە |
| حوش | حەوشە |
| ساحة | گۆڕەپان، حەوشە |
| صفوف | پۆلەکان |
| صف | پۆل |
| صبورة | تەختەی ڕەش |
| كرسي | کورسی |
| مُدير | بەڕێوەبەر |
| مُعلم | مامۆستا |
| مُدرس | مامۆستا |
| أستاذ | مامۆستا |
| مشرف | سەرپەرشتیار |
| طالب | قوتابی |
| ذكي | زیرەك |
| كتاب | کتێب |
| دفتر | دەفتەر |
| كاغد | کاغەز |
| قلم | قەڵەم |

| | |
|---|---|
| *قلم حبر* | *قەڵەم پاندان* |
| قلم جاف | قەڵەم جاف |
| قلم رصاص | قەڵەمی ڕەساس |
| حبر | مرەکەب |
| جنطة | جانتا |
| مقطاطة | قەڵەم دایەن |
| مساحة | لاستیك |
| ورق | کاغەز |
| أنت بیا مدرسه؟ | تۆ لە چ قوتابخانەیەکی؟ |
| بیا صف | لە پۆلی چەنی؟ |

استاذ محمد یدرسنا

مامۆستا محەمەد دەرسمان پێ دەڵێتەوە.

| | |
|---|---|
| *عندك مساحة؟* | *لاستیکت پێیە؟* |
| جنطة مالك مشگوگ. | جانتاکەت دڕاوە. |
| یعجبك آلمدرسة؟ | قوتابخانەکەت بە دڵە؟ |
| أکتب عالصبورة | لەسەر تەختەڕەشەکە بنووسە. |

## هەندێك ووشە لە بینا سازیدا

| | |
|---|---|
| بيت | ماڵ - خانو |
| بيتونة | ماڵۆچکە |
| حمام | حەمام - گەرماو |
| تواليت | دەست شۆر |
| مرافق | ئاودەست |
| طابق | نهۆم |
| گاعيه | زەویەکەی |
| سگف | سەقف |
| زاويه | گۆشە |
| مُربَع | چوار گۆشە |
| مُثلَث | سێ گۆشە |
| شباچ | پەنجەرە |
| باب | درگا |
| حنفية | بەلوعە |
| بوري | بۆری |
| سدادة | سەدادە |
| صبْغ | بۆیاخ |
| حديدة | ئاسن |
| خشَب | تەختە |
| أسطة | وەستا |

